




# پەنجا چیرۆک

# لە زاری پێغەمبەری خوداوە

نووسینی: ئەبو ئیسحاق حەوەینی

وەرگێڕانی: کارمەند خدر

# پەنجا چیرۆک

## لە زاری پێغەمبەری خوداوە

سڵاوی خوای گەورەی لەسەربێت



وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: کارمەند خدر




# ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد



**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، نزیك ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوردان.

**پەیوەندی:** 07501696369 - 07731974646 - 07501590032 - 07701974656

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/


ناسنامەی کتێب


ناونیشان: پەنجا چیرۆک لە زاری پێغەمبەری خودا وە سڵاوی خوای لەسەر بێت.

نووسەر: ئەبو ئیسحاق حەوینی.

وەرگێڕانی: کارمەند خدر.

پێداچوونەوەی: کارزان خدر.

بابەت: ئاینی.

بەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

ساڵی چاپ: ٢٠٢١ میلادی، چاپی یەکەم.

لە بەڕیوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٤٩١) ساڵی (٢٠٢٠) پێی دراوە،

## میراتی پێغەمبەر (سڵاوی خوای گەورەی لەسەربێت) چییە؟

أبو هریره (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕۆژێک لە بازاڕ دەسوڕایەوە بینی خەڵک خۆیان سەرقاڵ کردووە بە دونیاو هەر یەکە خەریکی کارێکن لەم بازاڕەدا.

بۆیە بانگی کردن ئەی خەڵکینە ئێوە لێرەن میراتی پێغەمبەریش(سڵاوی خوای گەورەی لەسەربێت) وا لە ناو مزگەوت دابەش دەکرێت.

خەڵکەکە بەپەلە ڕایان کرد بۆ مزگەوت، پاشان هاتنەوە لای ابو هریره ووتیان: خۆ هیچمان نەبینی دابەش بکریت لە مزگەوت.

أبو هریره پێی ووتن:

ئایا کۆمەڵیک لە موسڵمانان قورئانیان نەدەخوێند؟

ئایا نەتان بینی کۆمەڵێکیش نوێژیان دەکرد؟

هەروها کۆمەڵێک باسی حەلالو حەرامیان دەکرد.

ئەوە میراتی پێغەمبەرە (سڵاوی خوای گەورەی لەسەربێت).

ئیتر دەبێت لەوە تێبگەین کە میراتی سەروەری مرۆڤایەتی بۆ ئێمە لە هەموو شتێک گرنگترە ئەوەی ئەو بۆی بەجێهێشتوین بە سەروەت و سامان دەستناکەوێت و دەبێت ئامۆژگارییەکانی هیچکات لە یاد نەکەین.

## پێغەمبەری ئازیزمان (سڵاوی خوای گەورەی لەسەربێت) مان لە دیدی چەند نووسەرێکی مەسیحیەوە.

نەسری سەلهەب مەسیحیەکی لوبنانیە کە بە دیدی بابەتیانەی و گەڕان بەدوای ڕاستیەکاندا ناسراوە لە کتێبەکەیدا بەناوی (فی خطا محمد) دەڵێت: مەلۆتکەیەک چاوی بە دنیا هەڵهێنا، کە لەکاتی لەدایک بونیدا هەرگیز لەبیری دایکیدا نەدەهات، کەدەبێتە گەورەترین پیاوی جیهان، بەڵکو گەورەترینی مێژوو، تا گەورەترین پیاو بە هەموو پێوەرەکان.

هەرکەسێک بە وردی سەرنجی ژیاننامەی ئەو پیاوە بدات، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە ددان بەوەدا بنێت، کە ئەو دەسکەوتانەی وەدەستی هێناون، لە دنیایەکی تری جیاواز لەو دنیایە بووە، کە مرۆڤ دەیناسیت.

گەورەی موحەممەد لێرەدایە، بەو ماوە کەمە توانی شەریعەتێکی پڕ ڕەوشتی گیانی و کۆمەڵایەتی، کە لە مێژوودا هیچکەس نەیتوانیووە بەو خێراییە سەرسوڕهێنەرە ئەو کارە گەورەیە بە ئەنجام بگەیەنێت.

موحەممەد تەنیا پێغەمبەر نەبووە کە خەلک بەرەو باوەڕ ڕێنمونی بکات، بەڵکو پێشەوا و سەرکردەی گەلێک بو و هەوڵی دا لەو گەلە باشترین و بەرزترین گەلی دنیا دروستبکات و لە کۆتایشدا توانی ئەوە وەدی بێنێت.

تۆماس کارلیل نوسەر و مێژوو نووس و فەیلەسوف تۆماس کارلیل نوسەر و مێژوو نووس و فەیلەسوفکی ئینگلیزیە لە کتێبێک (الابطال و العبادە و الابطال)دا دەڵێت: بە درێژایی ژیانی خاوەن باوەڕێکی جێگیر بوو، هیمەتێکی بەرزی هەبوو خەمخۆر بوو، بەخشندە و چاکەکار نوو بەبەزەی و خودا پەرست بوو، خاوەن پیاوەتی ئازاد بوو کۆڵنەدەر و دڵسۆز بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەجلیس خۆشبوو خوڕەوشتێکی نەرم و نیانی هەبوو، ڕووخۆش و شادومان بوو، خۆش ڕەفتار و گوفتار شیرین بوو، بە گشتی خەندەیەکی درەوشاوە لە ڕوویدا بەدی دەکرا کەلە دڵ و دەرونێکی ڕاستگۆوە سەرچاوەی گرتبوو .. بیر تیژ و وشیار بووە .. ، لە قوتابخانەدا ڕۆشنبیری وەرنەگرتبوو لەسەر دەستی هیچ مامۆستایەک وانەی پێ نەدابوو، ئەو هیچ پێویستی بەوە نەبوو ..

هەروەها دەربارەی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا دەڵێت: من موحەممەدم خۆشدەوێت، چونکە سروشتی ئەو دوور بوو لە خۆ دەرخستن و خۆ نواندن .. تەنیا پشتی بە خۆی و خوداکەی دەبەست هەرگیز بانگەشەی شتێکی نەدەکرد لە خۆیدا نەبێت، لوت بەرز نەبوو، بەڵام لەبەرامبەریشدا نزم و کەساس نەبوو.. ئازادانە لەگەڵ قەیسەری ڕۆم و شای عەجەمدا دەدوا، پێی ڕاگەیاندن کە لەسەریان پێویستە چی بکەن لە ژیانی دونیا و دوارۆژیان بەڕاستی ئەو پێگەی خۆی دەزانی.

د.نەزمی لۆقا مەسەیحیەکی میسرییە کە بەدیدی بابەتیانە و دڵسۆزی بۆ ڕاستی بەناو بانگە لە کتێبی (محمد الرسالە و الرسول)دا دەڵێت: محمدا وەک هیچ تاکێکی خەڵک نەبوو لە ڕوی

ڕەوشت و لێهاتویدا خەسڵەتی پێغەمبەران و هیمەتی پاڵەوانانی تێدا کۆبونەتەوە، بۆیە لەسەر مرۆڤی حەق دۆست پێویستە دان بە پێشەوایی ئەودا بنێت و بەگەورە پیاوی ببینێت.

پاشـان دەربـارەی گەورەی و لە خـۆ بـوردەیی و ڕەوشـتی بەرزی دەڵێت :{ تاکە پیاو بوو، زوبانی ئاسمان بوو، گشت بەندە باوەڕدارەکانی موسوڵمانانیشـی لەژێـر دەسـتا بـوون بەڵام ئەو پیـاوە ڕەتـی کـردەوە توشـی خـۆ بە زلـزانین ببێـت، بەڵکـوو لەبەرامبەردا بەبەزەی و بەخشندە بوو..}.

لەسەر باسی لە خۆبوردەیی پێغەمبەری خوا بەردوام دەبێت و دەڵێت :{ هـاوەڵانی پێیانـدا هەڵ دەگوت کەچـی پێـی دەفەرمـون: ئەوەنـدە بەسـەرمدا هەڵمەڵـێن و بەو ئەنـدازەیە گەورەم مەکەن هەروەک چۆن گاورەکان عیسای کوڕی مریەمیان گەورە کرد، بەڵکو بڵـێن بەنـدەی خـوا و پێغەمـبەری خـوا، یـان ئەو کـاتەی دەچێتە نێو کۆمەڵێک لەهـاوەڵانی و ئەوانیش لەبەری هەڵدەسـتن، ئەویش لۆمەیـان دەکـات لەسـەر ئەو کـارە و پێیـان دەفەرموێت: (وەکو عەجەمەکـان مەکەن و یەکتـری بەبەرز ڕامەگرن و لەبەر یەکتر هەڵمەستن).

سەرنج: ئەم کتێبە بە ناوی ((صحیح القصص النبوی)) کە دەکاتە: "چیرۆکە ڕاستییەکانی پێغەمبەر" ناوەکەیمان گۆڕیوە بۆ " پەنجا چیرۆک، کە پێغەمبەری خوا بۆمان دەگێڕیتەوە." چونکە ناونیشانەکەیمان بە باشتر زانیوە...

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکیی نووسەر:

"إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ"

فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

بە ڕاستی لەو ماوەیەی کە خەریکی وانەگوتنەوە و بانگەواز بووم، گرنگییەکی تایبەتم بە نامیلکەی ((صحیح قصص النبوی)) داوە. بە هۆی حەز و خۆشەویستیی خەڵک بۆ گوێگرتن لە چیرۆک و دڵخۆشبوونێکی لە ڕاددەبەدەریان بەو ڕووداوانەی کە پێغەمبەر (صل الله علیه وسلم) باسیان دەکات و بە هۆی گرنگیدان و پرسیارکردنیان دەربارەی ئەو ئاداب و حوکمانەی، کە لەو چیرۆکانە هەڵدەهێنجرێن. بۆیە بڕیارم دا کتێبێک بنووسم بە ناوی ((اسعاف الجریح بالقصص نبوی الشریف))، پاشان دەستم کرد بە شەرحکردن و هەڵێنجانی ورد و درشتی حوکم و ئادابەکانی ناو چیرۆکەکان، بەڵام ئەو کتێبەیان هەتا ئێستا ماویەتی و تەواو نەبووە، پاشان هەندێ لە برایان ئەوەیان بۆ پێشنیار کردم، کە بەتەنیا چیرۆکەکان و جیا لە شەرح و هەڵێنجانی حوکم و ئادابەکان لە نامیلکەیەکدا کۆبکەمەوە، بۆ ئەوەی ئەو دەقە "صحیح"انە زووتر بگەن بە دەستی بانگخوازان

و وتاربێژان. تا له وتار و دەرسەکاندا باسی بکەن و خۆیان و خەڵکیش سوودی لێ ببینن. چون زۆرێک له بانگخواز و وتاربێژان حەدیسه "صحیح" و "ضعیف"ەکان لێک جیا ناکەنەوە. زۆربەی ئەو چیرۆکانەشی که له وتار و دەرسەکانیاندا باسی دەکەن "ضعیف"ن، ئەگەر ئەو بانگخواز یان وتاربێژە سەرنج بدا هەندێک لەو چیرۆکانه هەر پووچ (باطل) و نابەجێشن و دژ به شەریعەتن، بۆیه من ئەو بیرۆکەیەم پێ باش بوو و پەسەندم کرد. هەر بۆیەش دەستپێشخەریم کرد له چاپکردنی و زوو بەچاپم گەیاند. هەندێک چیرۆکی دیکەش ماون که ئێستا خەریکم لێیان دەکۆڵمەوە و هەڵیان دەوێژێرم، ئەوەی بۆمان دەرکەوت که "صحیح"ە به یارمەتیی خوا چاپی دەکەین و بڵاوی دەکەینەوە.

لەو نامیلکەیەدا پلەی فەرموودەکەم له پاشی نووسیوه لەگەڵ تەخریجێکی[1] کورت که بگونجێت لەگەڵ ئەم کتێبەدا.

بەڵام تەخریجی ورد و شیکردنەوەی تێروتەسەل، ئەوەیان گەر خودا ویستی لەسەر بێت له کتێبی ((الاسعاف))دا دەبێت.

ئەوەش زنجیرەیەکە، که به ((قصص النبوی)) دەستم پێ کرد، له پاشاندا دەست دەکەم به نووسینی کتێبێک لەسەر ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەر و ئەو ڕووداوە گرنگانەی، که له ژیانیاندا ڕوویانداوە. له سێیەمیاندا دەست دەکەم به نووسینی کتێبێک لەسەر ژیانی شوێنکەوتووان (تابعین) له هەرسێک لەو

[1] تەخریج: سەرچاوە

کتێبانەشـدا تەنیـا پشـتم بە سـەرچاوەی "صـحیح" و دروسـت بەسـتووە، بەم هۆیەشـەوە هیـوادارین کە ئەو زنجیـرەیە لە زنجیرەی نووسـەرەکانی دیکە جیـاواز بێت. چـونکە ئەوان بەو شـێوە جـددییە گرنگییـان بە "صـحیح"ی و "ضـعیف"ی سـەرچاوەکان نەداوە، هیـوادارین موسـوڵمانانیش سـوود لەو بابەتـانە ببینـن. لە کاتێکـدا هەر کەسـە و رێچـکە و رێبـازێکی گرتووە بۆ خۆی، دوژمنەکانیشمان دەستیان بەسەردا گرتـووین و لە هەمـوو لایەکەوە گەمارۆیـان داویـن. بـۆیە داوا لە خـوا دەکەیـن کە گەورەیـی و دەسـەڵات بـۆ ئەو ئـوممەتە بگێـڕێتەوە. دەسـەڵات بـدا بەو کەسـانەی گـوێڕایەڵیی ئەو دەکەن و ئەوانەش ڕسوا و زەلیل بکات، کە ڕێگەی شـەیتان هەڵدەبژێرن. ئەوانەش سـەرفراز بکـا، کە ئەمر بە چـاکە دەکەن و ڕێ لە خـراپە دەگرن. چونکە هەر ئەو توانا و دەسـەڵاتی بەسـەر هەمـوو شـتێکدا هەیە، لە کۆتاییـدا سـوپاس بـۆ ئەو خـوایەی یەکەم و کۆتـایە و دیـار و نادیارە.

نووسینی

بەندەی لاواز و چاوەڕێی بەخشندەیی خوا "شیخ ابو ئیسحاق الحوینی"

# چیرۆکی یەکەم

**ئەو سێ کەسەی لە ئەشکەوتێکدا گیریان خوارد.**

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ، دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: سێ کەس لە گەلانی پێش ئێوە بۆ سەفەرێک بەڕێکەوتن، تا لە ڕێگە بۆ پشوودان و مانەوە ڕوویان لە ئەشکەوتێک کرد و چوونە ناوی، لەو کاتەدا کە ئەوان لەناو ئەشکەوتەکەدا بوون، بە فەرمانی خوا بەردێکی گەورە لەسەر شاخ خلۆربۆوە و هاتە پێش ئەشکەوتەکە، بەو شێوەیە ڕێی دەرچوونی لەو گەنجانە گرت و وای کرد کە نەتوانن بێنە دەرەوە. ئینجا گەنجەکان لەناو خۆیاندا گوتیان: بە ڕاستی تەنیا بەوە ڕزگارمان دەبێ کە هەر یەکە و بە کارێکی چاکی خۆی لە خوا بپارێتەوە، کە پێشتر لەبەر خاتری خوا کردوویەتی. ئینجا یەکێک لەو سێ گەنجە ڕووی لە ئاسمان کرد و گوتی: خودایە من دایک و بابێکی پیرم هەبوون، کە هەتا نانی ئێوارەم نەدابا بەوان نەمدەدا بە ژن و منداڵەکانم. ڕۆژێکیان لەوەڕگای مەڕ و ماڵاتەکەم دوور بوو و درەنگ گەڕامەوە بۆ ماڵ، کە هاتمەوەش دایک و بابم نووستبوون، دڵیشم نەهات خەبەریان کەمەوە، بۆیە قاپە خواردنەکەم هەر لەسەر دەست بوو و نەمدا بە ژن و منداڵەکانم، هەتا بەیانی کاتی ڕۆژهەڵاتن چاوەڕێم کردن، کە هەستان ئینجا خواردنەکەم پێدان. خودایە ئەگەر لەبەر خاتری تۆ ئەوەم کردووە، ئەوە بەهانامانەوە وەرە و ئەو بەردەمان بۆ لاببە، لە دوای ئەوە بەردەکە تۆزێک لاچوو. بەڵام بەو ڕاددەیە نا

کە بتوانن لێیەوە بچنە دەر. ئینجا دووەم کەس لەو سێ کەسە ڕووی لە ئاسمان کرد و لە خودا پاڕایەوە، گوتی: خودایە من کچەمامێکم هەبوو زۆرم خۆش دەویست، زۆر هەوڵمدا دەستم پێی بگات، بۆیە چەن جارێک داوام لێ کرد کە بچم بۆ لای و زینا بکەین بەڵام ئەو کچێکی داوێن پاک بوو و ڕازی نەبوو، هەتا ساڵێکیان ئەو کچە و خێزانەکەی زۆر دەستکورت و هەژار بوون، بۆیە داوای بڕە پارەیەکی لێ کردم، منیش بەو مەرجەی کە زینا بکەین ڕازی بووم و سەد و بیست دینارم پێدا، ئینجا چووم بۆ لای و لە جێگایەک بە تەنیا ماینەوە، لەو کاتەدا کە ئەوپەڕی حەز و ئارەزووم بۆ زینا هەبوو کچەکە پێی گوتم: ئەی فلان کەس لە خودا بترسە و ئەو کارە مەکە، ئینجا لێی کشامەوە، لە کاتێکدا لە هەموو کەس زیاتر خۆشم دەویست، توانای ئەوەشم هەبوو زینای لەگەڵ بکەم، پاشان پارەکەشم لێ وەرنەگرتەوە و پێم گوت: با بۆخۆت بێ. خودایە ئەگەر ئەو کارەم لەبەر خاتری تۆ کردووە ئەوە بە هانامانەوە وەرە و ئەو بەردەمان بۆ لاببە، دوای ئەوە بەردەکە تۆزێکی دیکە لاچوو، بەڵام هێشتاش بەو ڕاددەیە نا کە بتوانن لێیەوە بچنە دەر، سێیەم کەس ڕووی لە ئاسمان کرد و لە خودا پارایەوە و گوتی: خودایە من کۆمەڵێک کرێکارم لەبەر دەست بوون و ئیشیان بۆ دەکردم، هەتا ئەو کاتەی ئیشەکەیان تەواو کرد و هاتن بۆ ئەوەی پارەکەیان بدەمێ، پارەی هەموویانم دا تەنیا یەکێکیان نەبێ کە پارەکەم پێ نەدا و ئەویش بەجێی هێشتم و ڕۆشت، ئینجا بە پارەی ئەو کرێکارە کڕین و فرۆشتن و بازرگانیم کرد، هەتا پارەکەی زۆر بوو، دواتر وشتر و مانگا و مەڕ و بزنم بۆ کڕی، ئیدی سەروەتەکەی بێ ئەنداز زۆر بوو! ئینجا دوای

ماوەیەک کرێکارەکە هاتەوە و داوای پارەکەی لێ کردم، منیش پێم گوت: ئەو هەمـوو وشـتر و مەڕ و بـزن و مانگـایەی کە دەیبینی هەمووی هیی تۆیە، کابرا گوتی: گاڵتەم پێ مەکە، منیش پێم گوت: گاڵتەت پێ ناکەم و بەڕاستمە، ئەوە هەموو هیی تۆیە و دەتوانی لەگەڵ خۆت بیانبەی، ئینجا کابرا هەموو شتەکانی بردەوە و تەنانەت شتێکی گچکەشی بەجێ نەهێشت. خودایە ئەگەر ئەو کارەم لەبەر خاتری تۆ کردووە ئەوە بەهانامانەوە وەرە و ئەو بەردەمان بۆ لاببە. ئینجا بەردەکە بەتەواوی لە جێی خۆی لاچوو و پیاوەکان چوونە دەرەوە.

((هذا حديث صحيح متفق عليه))

# چیرۆکی دووەم

**ئەو پیاوەی سەد کەسی کوشت.**

لە ئەبوسەعیدی خودریەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ((لە سەردەمانی پێش ئێوەدا پیاوێک هەبوو نەوەدونۆ کەسی کوشتبوو، پرسیاری لە خەڵک کرد کە زاناترین کەسی ئەو سەردەمەی پێشان بدەن، ئەوانیش ناوی ڕاهیبێکی جولەکەیان پێشاندا کە بچێت بۆ لای. کابرا چوو بۆ لای ڕاهیبەکە و گوتی: من تاوانێکی زۆرم کردووە و نەوەدونۆ کەسم کوشتووە، ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟ ڕاهیبەکە گوتی: نەخێر ئەتۆ خەڵکێکی زۆرت کوشتووە و بۆت نییە تەوبە بکەی. کابرا ڕقی لێ داگرت و ئەویشی کوشت. پاشان بەردەوام بوو لە پرسیارکردن و دووبارە پرسیاری لە خەڵک کرد کە زاناترین کەسی سەر زەوی پێشان بدەن. ئەو جارەیان ڕاهیبێکی زاناتریان بۆ دەستنیشان کرد. کابرا ڕۆیشت بۆ لای ئەو ڕاهیبە و گوتی: من تاوانێکی زۆرم کردووە و سەد کەسم کوشتووە، ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟ زانایەکە وەڵامی دایەوە و گوتی: بەڵێ جا بۆ کەس توانای ئەوەی هەیە دەرگای تەوبە دابخا؟ بڕۆ بۆ فڵانە شوێن چونکە خەڵکی ئەو شوێنە خواپەرست و چاکەکارن و تۆش لەگەڵ ئەوان خەریکی خواپەرستی و چاکەکاری خۆت بە، هەرگیزیش مەگەڕێوە شوێنەکەی خۆت چونکە ئەوە زەوی خراپەیە و لەوێدا تووشی تاوان و خراپە دەبیتەوە، کابرا بە قسەی زانایەکەی کرد و بەڕێکەوت بۆ ئەو شوێنە، لە نیوەی ڕێگە مردن بەرۆکی گرت،

ئینجا فریشتەی سزا و فریشتەی بەخشش لێیان بوو بە کێشە لەسەری، هەر یەکەیان دەیویست بۆ خۆی گیانی بکێشێ و لەگەڵ خۆی ببات، فریشتەی سزا دەیگوت: ئەو کابرایە لە هەموو تەمەنیدا چاکەیەکی نەکردووە، جگە لەوەش تاوانی زۆری کردووە و نەوەدونۆ کەسی کوشتووە، فریشتەی بەخششیش دەیگوت: کابرا بەدڵ پەشیمان بۆتەوە و تەوبەی کردووە، ئێستاش لە ڕێگەی گەڕانەوە بوو بۆ لای خودا، لەو قسانەدا بوون کە فریشتەیەک لەسەر شێوەی بەشەر هاتە لایان و ئەوانیش کردیان بە دادوەر بۆ ئەوەی ئەو کێشەیان بۆ چارەسەر بکات. فریشتەکە پێی گوتن: ئەندازەی نێوان هەردوو زەوییەکە بپێون، بزانن لەو زەوییە نزیکترە کە نیازی هەبوو بۆی بچێ یان لەو زەوییە نزیکترە کە لێوەی هاتووە، لە کامە زەوییە نزیکتر بوو، هی ئەو زەوییەیە. دوو فریشتەکە ئەندازەیان گرت و بۆیان دەرکەوت لەو زەوییە نزیکترە کە دەیەویست بۆی بڕوات، ئینجا فریشتەی بەخشش هات و گیانی کابرای کێشا)).

((هذا حديث صحيح متفق عليه))

## چیرۆکی سێیەم

**جادووگەر، منداڵ، ڕاهیب و پاشا.**

لە سوهەیبی ڕۆمییەوە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێ، کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی:(( لە سەردەمانی پێش ئێوەدا پاشایەک هەبوو، ئەو پاشایەش جادووگەرێکی هەبوو، کاتێک جادووگەرەکە پیر بوو و بەتەمەندا چوو داوای لە پاشا کرد منداڵێکی بۆ بێنێ بۆ ئەوەی فێری جادووی بکات و ئەگەر ئەویش مرد منداڵەکە جێگای بگرێتەوە. پاشا منداڵێکی بۆ جادووگەرەکە پەیدا کرد، ئیدی ئەو منداڵە بوو بە قوتابیی ئەو جادووگەرە و بەردەوام بۆ فێربوونی جادوو هاتووچۆی جادووگەرەکەی دەکرد، لە ڕێگەشدا کە دەچوو بۆ لای جادووگەرەکە ڕاهیبێکی خواناس هەبوو کە پێش ئەوەی بچێتە لای جادووگەرەکە، ماوەیەک لە لای ئەو ڕاهیبە دەمایەوە و گوێی لێ دەگرت و فێری یەکخواپەرستی دەبوو. بەو هۆیەشەوە هەموو جارێک دوادەکەوت و جادووگەرەکە لێی دەدا، ڕۆژێکیان منداڵەکە بە ڕاهیبەکەی گوت: من هەر جارێک دوابکەوم ئەو جادووگەرە لێم دەدات، چار چییە؟ ڕاهیبەکە پێی گوت: بۆ ئەوەی جادووگەرەکە ئازارت نەدات و لێت نەدا بڵێ: لەبەر ماڵەوە دواکەوتم، ئەگەر ترست هەبوو ماڵەوەش ئازارت دەن، بڵێ: بە هۆی جادووگەرەکەوە دواکەوتم. بەم شێوەیە بەردەوام بوو هەتا ڕۆژێکیان تووشی بوو بە تووشی ئەو گیاندارە زل و زەبەلاحەی کە ڕێگەی لە خەڵکی دەگرت و خەڵکی ئەزیەت دەدا. منداڵەکە بە خۆی گوت: ئەمڕۆ بۆم

دەردەکەوێ کە جادووگەرەکە ڕاست دەکا یان ڕاهیبەکە، ئینجا بەردێکی هەڵگرت و گوتی: خودایە ئەگەر قسەکانی ڕاهیبەکەت لە هی جادووگەرەکە لەلا خۆشەویستترە ئەوە ئەو گیاندارە لەناو ببە بۆ ئەوەی چیدیکە ڕێ لە خەڵک نەگرێت و خەڵک ئەزیەت نەدا. ئینجا بەردەکەی هاویشت و گیاندارەکەی پێ کوشت و خەڵک لەدەستی ئەو گیاندارە ئیسراحەتی کرد. بۆشی دەرکەوت کە ڕاهیبەکە ڕاستە و جادووگەرەکە درۆ دەکات، دوای ئەوەی کە ئەو گیاندارە دڕندەی کوشت هاتەوە لای ڕاهیبەکە و بۆی باس کرد. ڕاهیبەکەش دەستی لەسەر شانی دانا و پێی گوت: کوڕم ئێستا تۆ لە من باشتری، وەک ئەوەی کە دەبینم فێری زۆر شت بووی و بە زۆر شت گەیشتووی، ئەوەش بزانە کە لەمەودوا تووشی تاقیکردنەوە و بەڵاو ناخۆشی دەبی، بەڵام هەرگیز نەکەی باسی من بکەی و شوێنی من بە کەس بڵێی، ئینجا ئەو منداڵە ئەوەندە لە خوا نزیک ببوویەوە کە بە فەرمانی خوا و لەسەر دەستی ئەو دەرد و نەخۆشیی خەڵکی چارەسەر دەکرد، بەڵەک و کوێر و زۆر نەخۆشیی دیکەی چارەسەر دەکرد. پاشاش وەزیرێکی کوێری هەبوو، کاتێک ئەو وەزیرە ئەوەی بیستەوە کە ئەو منداڵە کوێر و بەڵەک چاک دەکاتەوە، بانگی کرد و دیاری و بەخششی زۆری خستە بەردەست، ئینجا پێی گوت: ئەوەی کە ئێستا خستمە بەردەستت هەمووی بۆ تۆ بەو مەرجەی چاوم چاک بکەیەوە، منداڵەکە گوتی: من کەس چاک ناکەمەوە بەڵکوو خوای تاک و تەنیا چاکیان دەکاتەوە، ئەگەر باوەڕت بەو خوایە هێنا ئەوە منیش بۆت دەپاڕێمەوە و خواش چاوت چاک دەکاتەوە، ئینجا وەزیرەکە باوەڕی بە خوا هێنا و منداڵەکەش بۆی لە خوا

پارایەوە، بە فەرمانی خوا یەکسەر چاوی چاکبوونەوە، پاشان وەکووو عادەتی خۆی چووە لای پاشا دانیشت، پاشا سەری سوڕ ما و لێی پرسیی: ئەوە کێ بینایی بۆ گەڕاندیەوە و چاوی چاک کردیەوە؟ وەزیرەکە گوتی: پەروەردگارم. پاشا تووڕە بوو و گوتی: بۆ جگە لە من کێی دیکە بە پەروەردگاری خۆت دەزانی؟ وەزیرەکە گوتی: پەروەردگاری من و تۆش ئەڵڵایە، پاشا کە گوێی لەو قسەیە بوو زۆر تووڕە بوو، وەزیری گرت و ئەشکەنجەی زۆری دا، وەزیریش بە ناچاری بۆ ئەوەی لەو ئەشکەنجەیە ڕزگاری بێ، ناو و شوێنی منداڵەکەی بە پاشا گوت، ئینجا پاشا گوتی: بڕۆن ئەو منداڵەم بۆ بهێنن، منداڵەکەیان بۆ هێنا و لەبەر دەستی پاشا دایاننیشاند، پاشا ڕوی لە منداڵەکە کرد و پێی گوت: کوڕی خۆم بە ڕاستی تۆ زۆر بەباشی فێری جادوو بووی و وات لێ هاتووە بەڵەک و کوێر چاک دەکەیەوە و زۆر شتی سەرسوڕهێنەر دەکەی. منداڵەکە یەکسەر جوابی دایەوە و گوتی: من هیچ ناکەم بەڵکووو خوای تاک و تەنیا ئەو کارانە دەکا، ئینجا پاشا کە زانیی ئەویش ئەو خوایە دەپەرستێ ئەویشی گرت و ئەشکەنجەی دا، منداڵەکەش بە ناچاری ناو و شوێنی ڕاهیبەکەی بە پاشا گوت. ئینجا پاشا فەرمانی کرد ڕاهیبەکەی بۆ بێنن، ڕاهیبیان بۆ هێنا و لەبەر دەستی پاشا دایاننیشاند، پاشا بە ڕاهیبەکەی گوت: واز لەو خوایە بێنە و بگەڕێوە سەر پەرستنی من، ئەگەر وانەکەی زۆر بە سەختی سزات دەدەم، ڕاهیبەکە ڕازی نەبوو و پەشیمان نەبوویەوە، ئینجا مشارێکیان هێنا لە تەپڵی سەریەوە دوولەتیان کرد، پاشان وەزیرەکەیان هێنا، ئینجا پاشا پێی گوت: واز لەو خوایە بێنە و بگەڕێوە سەر پەرستنی من، ئەگەر وا نەکەی زۆر بە سەختی

سزات دەدەم، وەزیرەکە ڕازی نەبوو و پەشیمان نەبوویەوە، ئەویش بە هەمان شێوەی ڕاهیبەکە موشارێکیان هێنا لە تەپڵی سەریەوە دوولەتیان کرد، پاشان منداڵەکەیان هێنا، پاشا پێی گوت: کوڕم واز لەو خوایە بێنە و بگەڕێوە سەر پەرستنی من، منداڵەکە پەشیمان نەبوویەوە، ئینجا پاشا فەرمانی کرد بە هەندێک لە پیاوەکانی کە بڕۆن بیبەن بۆ سەر فلانە شاخ، کاتێک گەیشتنە سەر لوتکەی شاخەکە دووبارە داوای لێ بکەن پەشیمان ببێتەوە، ئەگەر هەر پەشیمان نەبوویەوە ئەوە لەسەر ئەو شاخەوە فڕێی دەنە خوارەوە، ئینجا پیاوەکانی پاشا ڕۆیشتن و منداڵەکەیان لەگەڵ خۆیان برد تا گەیشتنە سەر لوتکەی شاخەکە، کاتێک گەیشتن منداڵەکە گوتی: خودایە ئەوە دامنە دەست تۆ بۆ خۆت لە کۆڵمیان بکەوە، بە فەرمانی خوا لەو کاتەدا شاخەکە بەتوندی لەرزیەوە و هەموو پیاوەکان کەوتنە خوارەوە جگە لە منداڵەکە، پاشان منداڵەکە بە تەنیا گەڕایەوە لای پاشا، کاتێک پاشا منداڵەکەی دیت لێی پرسیی: ئەو پیاوانەی لەگەڵت بوون چییان بەسەر هات؟ منداڵەکە گوتی: خوا لە کۆڵمی کردنەوە، پاشا سەری سوڕما و ئەمجارە زیاتر سوور بوو لەسەر ئەوەی منداڵەکە بکوژێ، بانگی کۆمەڵێک پیاوی دیکەی کرد و گوتی: بڕۆن لەگەڵ خۆتان سواری کەشتییەکی بکەن و بیبەنە ناوەڕاستی دەریا، ئەگەر پەشیمان بوویەوە ئەوە باشە ئەگەرنا لە ناوەڕاستی دەریا فڕێی بدەنە ناو ئاوەکە و بگەڕێنەوە، پیاوەکان بە قسەی پاشایان کرد و لەگەڵ خۆیان بردیان، کاتێک گەیشتنە ناوەڕاستی دەریا منداڵەکە گوتی: خودایە ئەوە دامنە دەست تۆ بۆ خۆت لە کۆڵمیان بکەوە، بە فەرمانی خوا کەشتییەکە سەرەو بن بوو و دواتر وەک خۆی لێ هاتەوە،

هەموویان نقووم بوون جگە لە منداڵەکە، منداڵەکە دووبارە بە تەنیا گەڕایەوە لای پاشا و لە بەردەستی پاشا ڕاوەستا، پاشا لێی پرسیی: ئەو پیاوانەی لەگەڵت بوون چییان بەسەر هات؟ منداڵەکە گوتی: خوا لەکۆڵمی کردنەوە، ئینجا بە پاشای گوت: تۆ ناتوانی من بکوژی هەتا ئەو کاتەی من شتێکت پێ دەڵێم و بە قسەم بکەی، پاشا گوتی: ئەو شتە چییە کە دەبێ بە قسەت بکەم؟ منداڵەکە گوتی: هەموو خەڵکی لە شوێنێک کۆبکەوە و پاشان بە قەدی دارخورمایەکدا هەڵمواسە، دواتر تیرێک لە تیردانەکەم دەربێنە و لە کەوانی باوێ، ئینجا بڵێ: ((بسم الله رب الغلام)) واتە: بە ناوی پەروەردگاری ئەو منداڵە، پاشان تیرەکە لە من بدە و بەو شێوەیە دەمرم، پاشا ئەوەی منداڵەکە پێی گوتبوو کردی و خەڵکی کۆکردەوە لە شوێنێک، ئینجا منداڵەکەی بە قەدی دارخورمایەکدا هەڵواسی، پاشان تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا و خستیە ناو کەوانەکەی و گوتی: ((بسم اللە رب الغلام)) واتە: بە ناوی پەوەردگاری ئەو منداڵە، پاشان تیرەکەی هاویشت لە بەینی چاو و گوێی منداڵەکەی دا، ئینجا منداڵەکە دەستی لەسەر شوێنی برینەکە داناو مرد، خەڵکەکە هەموو وێکڕا گوتیان: ((آمنا برب الغلام))، واتە: باوەڕمان بە پەروەردگاری منداڵەکە هێنا، ئینجا دار و دەستەی پاشا هاتن و پێیان گوت: ئەوە ئەو ڕۆژە بوو کە لێی دەترسای، بەڕاستی وا ئێستا بەسەرت هات و خەڵکەکە باوەڕیان هێنا، ئینجا پاشا فەرمانی کرد چاڵێکی گەورە هەڵکەنن و ئاگری تێدا بکەنەوە، دواتر دانە بە دانە داوا لەو خەڵکە بکەن پەشیمان بێتەوە، هەر کەسێک پەشیمان نەبوویەوە فڕێی بدەنە ناو ئەو چاڵە. ئەوانیش بە قسەیان کرد و ئەوەی پەشیمان نەبوویەوە فڕێیان دایە ناو چاڵە

ئاگرەکە، هەتا گەیشتە نۆرەی ژنێک کە منداڵێکی لەگەڵ بوو، ژنەکە نەیدەوێرا خۆی فڕێداتە ناو ئاگرەکە و ویستی دوورکەوێتەوە، لەو کاتەدا منداڵەکەی هاتە قسە و گوتی: دایەگیان مەترسە و ئارام بگرە، چونکە بەڕاستی تۆ لەسەر حەقیت)).

((هذا حديث صحيح اخرجه مسلم))

# چیرۆکی چوارەم

## ئەو پێغەمبەرەی قسەی لەگەڵ خۆر کرد.

ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی:

(( لە سەردەمانی پێش ئێوەدا پێغەمبەرێک لەگەڵ گەلەکەی ڕۆیشتن بۆ جیهاد. پێش ئەوەی وەڕێکەون بە هاوەڵەکانی گوت: هەر کەسێک ژنی مارە کردووە و نەچۆتە لای، با لەگەڵمان نەیەت. هەر کەسێک دیواری خانووەکەی بەرزکردۆتەوە و بنمیچ (سەقف)ەکەی تەواو نەکردووە، با لەگەڵمان نەیەت. هەر کەسێک مەڕومالاتێکی ئاوسی کڕیوە و چاوەڕێی زانیان دەکا، با لەگەڵمان نەیەت. پاشان وەڕێکەوتن هەتا کاتی نوێژی عەسر گەیشتنە گوندێک. لەو کاتەشدا تیشکی خۆرەکە زۆر بەتین بوو. ئینجا ئەو پێغەمبەرە ڕووی لە خۆر کرد و گوتی: منیش و تۆش فەرمان پێکراوین و دەبێ فەرمانی خوا جێبەجێ بکەین. پاشان لە خوا پاڕایەوە و گوتی: خوایە تیشکی خۆرمان لێ بشارەوە هەتا تەواو دەبین لە جیهاد. ئینجا خوا تیشکی خۆری لێ شاردنەوە هەتا لە جیهاد تەواو بوون و دەسکەوت و غەنیمەتێکی زۆریان لەو شەڕەدا کەوتە دەست. لەو سەردەمەشدا دەستکەوت حەڵاڵ نەبوو و کەس بۆی نەبوو غەنیمەت گل بداتەوە. دەبوایە غەنیمەتەکەیان کۆ کردبایەوە و دواتر بە فەرمانی خوا ئاگر دەهات و هەمووی دەخوارد. بۆیە کاتێک ئەو پێغەمبەرە و هاوەڵەکانی غەنیمەتەکەیان کۆ کردەوە، ئاگرەکە هات، بەڵام غەنیمەتەکەی نەخوارد. پێغەمبەرەکە یەکسەر زانیی کە یەکێک خیانەتی لە غەنیمەتدا کردووە و شتێک

لەو غەنیمەتە دیار نییە. بۆیە ڕووی لە خەڵکەکە کرد و گوتی: ئێوە دەستپیس و ناپاکتان تێدایە و کەسێک لە ئێوە شتێکی لەو غەنیمەتە بردووە. بۆیە لە هەر هۆزێک با کەسێک بێت دەست بخاتە دەستم و بەیعەتم پێ بدا. ئینجا لە هەموو هۆزێک کەسێک هات و دەستی خستە ناو دەستی. هەتا دەستی یەکێکیان وەکوو چەسپ بە دەستی پێغەمبەرەکەوە نووسا. پێغەمبەرەکە گوتی: ناپاکەکە لەناو ئێوەدایە، با هۆزەکەی تۆ هەموویان بێن دەس بخەنە ناو دەستم و بەیعەتم پێ بدەن. پاشان هاتن و ئەمجارەیان دەستی سێ بۆ چوار کەس بە دەستی پێغەمبەرەکەوە نووسا. دووبارە گوتی: ناپاکەکە لەناو ئێوەدایە، کێیە با خۆی ئاشکرا بکات و ئەوەی بردوویەتی بیهێنێتەوە. ئینجا کەللەسەرێکی زێڕین، کە لە شێوەی سەری مانگا بوو، هێنایانەوە و فڕێیان دایە ناو غەنیمەتەکە. ئینجا ئاگرەکە هات و غەنیمەتەکەی خوارد. پاشان پێغەمبەر محەممەد سەلامی خوای لێ بێ فەرمووی: بە ڕاستی لە پێش ئێمەدا غەنیمەت بۆ کەس حەڵاڵ نەبوو، بەڵام کاتێک خوا لاوازی و بێدەسەڵاتیی ئێمەی بینی، بۆی حەڵاڵ کردین)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

# چیرۆکی پێنجەم

## بەڵەک و کەچەڵ و کوێر.

لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((لەناو نەوەی ئیسرائیلییەکاندا سێ کەس هەبوون، بەڵەک و کەچەڵ و کوێرێک، ڕۆژێکیان خوا ویستی تاقییان بکاتەوە و ئیمتحانیان بکات، بەو شێوەیە فریشتەیەکی بۆ ڕەوانە کردن، فریشتەکە یەکەم جار ڕۆیشت بۆ لای بەڵەکەکە و پێی گوت: خوا منی ناردووە بۆ ئەوەی هەرچییەکت ویست، بۆت جێبەجێ بکەم. ئێستا پێم بڵێ حەزت لە چییە و داوای چی دەکەی؟ کابرای بەڵەک وڵامی دایەوە و گوتی: دەمەوێ ڕەنگ و پێستێکی جوانم هەبێ و ئەو پیسییە بە پێستمەوە نەمێنێ تا چیتر خەڵک بێزم لێ نەکەن، فریشتەکە دەستێکی بە پێستی داهێنا و بە فەرمانی خوا ڕەنگی پێستی جوان بوویەوە و پیسییەکەی پێوە نەما. ئینجا فریشتەکە پێی گوت: ئەی لە ماڵی دونیا حەزت لە چ شتێکە؟ کابرا گوتی: حەزم لە وشترە، بە فەرمانی خوا ئەو فریشتەیە وشترێکی ئاوسی پێدا و گوتی: خوا بەرەکەتی تێ بخا، پاشان فریشتەکە ڕۆیشت بۆ لای کەچەڵەکە و پێی گوت: خوا منی ناردووە بۆ ئەوەی هەرچییەکت ویست بۆت جێبەجێ بکەم، ئێستا پێم بڵێ حەزت لە چییە و داوای چی دەکەی؟ کابرای کەچەڵ وڵامی دایەوە و گوتی: دەمەوێ پرچم چاک بێتەوە و ئەو خەڵکە هیچی دیکە بێزم لێ نەکەن، فریشتەکە دەستێکی بە سەریدا هێنا و بە فەرمانی خوا پرچی پڕ بوویەوە، ئینجا فریشتەکە پێی گوت: ئەی

له ماڵی دونیا حەزت لە چ شتێکە؟ کابرا گوتی: حەزم لە مانگایە، بە فەرمانی خوا فریشتەکە مانگایەکی ئاوسی پێدا و گوتی: خوا بەرەکەتی تێ بخا. پاشان ڕۆیشت بۆ لای کوێرەکە و پێی گوت: خوا منی ناردووە بۆ ئەوەی هەرچییەکت ویست بۆت جێبەجێ بکەم، ئێستا پێم بڵێ حەزت لە چییە و داوای چی دەکەی؟ کابرای کوێر وەڵامی دایەوە و گوتی: دەمەوێ چاوم چاک ببنەوە و خەڵکیان پێ ببینم، فریشتەکە دەستێکی بەسەر چاویدا هێنا و بە فەرمانی خوا بینایی بۆ گەڕایەوە، ئینجا فریشتەکە پێی گوت: ئەی لە ماڵی دونیا حەزت لە چ شتێکە؟ کابرا گوتی: حەزم لە مەڕە، ئینجا فریشتەکە مەڕێکی ئاوسی پێدا و گوتی: خوا بەرەکەتی تێ بخا، ئینجا سەروەت و سامانی هەرسێکیان زۆر بوو و بوونە خاوەنی مەڕوماڵاتێکی زۆر، بەڵەکەکە بوو بە خاوەنی دۆڵێک لە وشتر و کەچەڵەکە بوو بە خاوەنی دۆڵێک لە مانگا و کوێرەکەش بوو بە خاوەنی دۆڵێک لە مەڕ، ئینجا دوای ئەو ماوەیە فریشتەکە لەسەر شێوەی کەسێکی هەژار و دەستکورت هاتەوە لایان. سەرەتا هاتە لای بەڵەکەکە و پێی گوت: کەسێکی فەقیر و دەستکورتم و لە سەفەرێکی دوورودرێژدام، لە دوای خوا ڕووم لە تۆ کردووە، بۆ خاتری ئەو خوایەی کە ئەو پێست و ڕەنگە جوانە و ئەو سەروەت و سامانە زۆرەی پێبەخشیوی یارمەتیم بدە و وشترێکم پێ بدە با سەفەرەکەمی پێ تەواو بکەم، کابرای بەڵەک گوتی: ماڵ و منداڵێکی زۆرم بە ملەوەیە و بۆ خۆم پێویستم پێیە، ئینجا فریشتەکە گوتی: هەست دەکەم دەتناسمەوە، تۆ هەر ئەو کەسە بەڵەکە نەبووی کە خەڵک بێزی لێ دەکردی؟ دەستکورت و هەژار نەبووی تا ئەوکاتەی خوا یارمەتیی دای و ئەو ماڵەی پێ

بەخشی؟ کابرای بەڵەک گوتی: نەخێر من ئەو سەروەت و سامانەم لە باب و باپیرانەوە بۆ بەجێ ماوە. فریشتەکە دوعای لێ کرد و گوتی: یاخوا ئەگەر درۆ بکەی خوا وەکوو خۆتت لێ بکاتەوە. ئینجا ئەوی بەجێ هێشت و هەر لەسەر شێوەی ئەو کەسە هەژارە ڕۆیشت بۆ لای کەچەڵەکە، هەمان شتی پێ گوت، کە بە بەڵەکەکەی گوتبوو، کابرای کەچەڵیش بە هەمان شێوەی بەڵەکەکە جوابی دایەوە، فریشتەکە پێی گوت: یاخوا ئەگەر درۆ بکەی خوا وەکوو خۆتت لێ بکاتەوە. پاشان ئەویشی بەجێ هێشت و ڕۆیشت بۆ لای کوێرەکە. پێی گوت: کەسێکی فەقیر و دەستکورتم و لە سەفەرێکی دووررودرێژدام، لە دوای خوا ڕووم لە تۆ کردووە، بۆ خاتری ئەو خوایەی کە چاوی چاک کردیەوە، یارمەتیم بدە و مەڕێکم پێ بدە با سەفەرەکەمی پێ تەواو بکەم، پاشان کوێرەکە وەڵامی فریشتەکەی دایەوە و گوتی: باش لە بیرمە ئەوکاتەی کوێر بووم، دواتر خوا بینایی بۆ گەڕاندمەوە و چاوی چاک کردمەوە، ئێستاش بە دڵی خۆت چیت حەز لێیە هەڵی بگرە و لەگەڵ خۆتی ببە. وەڵاهی لەبەر خاتری خوا دەستت ناگرم لە هەر شتێک کە دەستی لەسەر دانێی و حەزت لێی بێ. ئینجا فریشتەکە پێی گوت: ماڵی خۆت بۆ خۆت و هیچم ناوێ، من تەنیا وەکوو تاقیکردنەوەیەک هاتبووم بۆ لای تۆ و دوو هاوڕێیەکەی دیکەت، بەڕاستی خوا لە تۆ ڕازی بوو و لە دوو هاوڕێکەی دیکەت تووڕە بوو)).

هذا حديث صحيح متفق عليه

## چیرۆکی شەشەم

### ئەو پیاوەی سەگەکەی تێرئاو کرد.

لە ئەبوهورەیرەەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ((لە کاتێکدا پیاوێک لە ڕێگەدا بوو بۆ سەفەرێک، تینوایەتی تەنگی پێ هەڵچنی و تینی بۆ هێنا، ڕۆیشت و بە دوای ئاودا گەڕا تا گەیشتە بیرێک. دواتر چووە ناو بیرەکە و ئاوی خواردەوە. کاتێک هاتەدەرەوە دیتی سەگێک لە تینوێتیدا وا هەناسەبڕکێیەتی و خۆڵ دەخوا. پیاوەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: بە ڕاستی ئەو سەگەش هاوشێوەی من تینووی بووە و لە حاڵێکی خراپدایە. دواتر دابەزییەوە ناو بیرەکە و پێڵاوەکەی پڕ کرد لە ئاو، ئینجا بە دەم و ددانی پێڵاوەکەی گرت هەتا لە بیرەکە هاتە دەر. دواتر پێڵاوەکەی لە پێش سەگەکە دانا و سەگەکەی تێرئاو کرد، بە هۆی ئەو کارەیەوە خوای گەورە لەو پیاوە خۆش بوو و سوپاسی کرد. لە ریوایەتێکی تردا دەفەرمووێ: خوای گەورە لێی خۆش بوو و بردیە بەهەشت، ئینجا هاوەڵانی پێغەمبەر پرسییان: ئەی پێغەمبەری خوا یانی لە چاکەکردن لەگەل گیاندارانیشدا پاداشتمان بۆ هەیە؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ چاکەکردن لەگەڵ هەر زیندوویەک پاداشتی خۆی هەیە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

# چیرۆکی حەوتەم

## ئەو سێ کەسەی بە ساوایی هاتوونە قسە.

لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ((تەنیا سێ کەس لە لانکەدا قسەیان کردووە، "عیسای کوڕی مەریەم"[٢] ، "جورەیجی خواناس" جورەیج پیاوێکی خواپەرست و دیندار بوو، کە ژوورێکی لە قوڕ و بەرد دروست کردبوو و دوور لە ئاوەدانی بۆ خۆی خەریکی خواپەرستی و دینداری بوو. ڕۆژێکیان دایکی هاتە لای، لەو کاتەشدا جورەیج خەریکی نوێژکردن بوو، دایکی بانگی کرد: کوڕم جورەیج؟! جورەیج لە دڵی خۆیدا گوتی: ئای خوایە! چی بکەم من وا لە نوێژدام و دایکیشم بانگم دەکا. جورەیج نوێژەکەی نەبڕی و بەردەوام بوو هەتا دایکی ماندووبوو لە چاوەڕێکردن و بە ناچاری جورەیجی بەجێ هێشت. ڕۆژی دواتر هاتەوە دووبارە جورەیج نوێژەکەی نەبڕی و وەڵامی دایکی نەدایەوە. سێیەم ڕۆژ هاتەوە، بە هەمان شێوە ئەمجارەش جورەیج نوێژەکەی نەبڕی و وەڵامی دایکی نەدایەوە. ئەمجارە دایکی لێی تووڕە بوو و دوعایەکی خراپی لێ کرد. گوتی: خودایە! جورەیج نەمرێ هەتا تووشی بە ئافرەتێکی داوێنپیسی نەکەی. جورەیج ناوی کەوتە سەر زاران و باس باسی خواناسی و دینداریی ئەو بوو لەناو نەوەی ئیسرائیلییەکان. خەڵک ئیرەیی پێ دەبرد. لەو کاتەدا

---

[٢]-چیرۆکی عیسای کوڕی مەریەم لەبەر ئەوەی زۆر باس کراوە و لە قورئاندا زۆر دووبارە بۆتەوە، لەم حەدیسەدا باس نەکراوە و تەنیا وەک ناو ناوی هاتووە. وەرگێڕ

ئـافرەتێکی داوێنپیسـی زۆر سـەرنجراکێش و شـۆخ و شـەنگیش هەبوو، ئەو ئافرەتە بە خەڵکەکەی گوت: ئەگەر پێتان خۆشە من لە خشـتەی دەبەم. دواتـر ئەو ئـافرەتە ڕۆیشـتە لای جـورەیج و هەموو هەوڵێکی دا بۆ ئەوەی سـەرنجی بە لای خۆیدا ڕابکێشـێ و لە خشتەی بەرێ، بەڵام جورەیج نەهاتە ژێر بار و ئاوڕی لـێ نەدایەوە. ئـافرەتەکە لە کـاتی گەڕانەوەیـدا شـوانێکی دیـت کە دەیویست بگەڕێتەوە ماڵ. ئیدی ڕۆیشـتە لای ئەو شـوانە و بە جـوانی و شـۆخ و شـەنگییەکەی فریـوی دا و لەگەڵـی نووسـت. دوای مـاوەیەک ئەو ئـافرەتە دووگیـان بـوو. کاتێـک منـداڵەکە لەدایک بوو لێیان پرسیی: ئەو منداڵە کوڕی کێیە؟ ئەویش گوتی: ئەوە لە جورەیجە و هیی ئەو جارەیە کە چوومە لای. خەڵکەکە کە گوێیان لەوە بوو، یەکسەر بەرەو لای جورەیج ڕۆیشتن و کە دیتیـان کەوتنە لێدان و سـوکایەتی پێکردنـی. ئەو ژوورەشـی لە بەرد و قـوڕ درووسـتی کردبـوو، لێیـان ڕووخانـد. جـورەیج زۆری لا سـەیر بـوو و پرسـیی: ئەوە بـۆ وا دەکەن؟ چـیم کـردووە؟ گوتیـان: تـۆ لەگەڵ ئەو ئـافرەتە داوێنپیسـە زینـات کردووە و منداڵت لێی هەیە. جورەیج پرسیی: کوا منداڵەکەم بۆ بێن. منـداڵەکەیان بـۆ هێنـا و گـوتی: تۆزێـک چاوەڕێم بـکەن بـا نـوێژەکەم بـکەم. نـوێژی کـرد و پاشـان ڕۆیشـتە لای منـداڵەکە. دەستی لە زگی دا و لێی پرسیی: بابت کێیە؟ منداڵەکە یەکسـەر هاتە قسە و گوتی: فڵان شوانە بابمە. خەڵکەکە کە ئەوەیان دیت، دەستبەجێ کەوتنە دەست و پێ ماچکردنی و داوای لێبووردنیان لـێ کـرد. دواتـر گوتیـان: ژوورێکـت لە ئـاڵتوون بـۆ درووسـت دەکەینەوە. جورەیج گوتی: نا، پێویست بەوە ناکا. با هەر لە قوڕ

و بەرد بێت وەک ئەوەی خۆم. بەو شێوەیە ژوورەکەیان وەکوو خۆی بۆ درووست کردەوە.

سێیەم کەس کە بە ساوایی قسەی کردووە، منداڵێکە لە ئامێزی دایکیدا بوو و خەریکی شیرخواردن بوو. لەو کاتەدا بە لای سوارچاکێکی ڕێک و کەشخەدا تێپەڕین کە بە سواری ئەسپەکەیەوە بوو. دایکی زۆر بە سوارچاکەکە سەرسام بوو و گوتی: خوایە! منداڵەکەم وەکوو ئەو سوارچاکە لێ بکە. منداڵەکە دەمی لە شیرەکە کردەوە و یەکسەر گوتی: خوایە! وەکوو ئەو پیاوەم لێ مەکە. دواتر دەمی بە مەمکی دایکییەوە نایەوە و لە شیرخواردن بەردەوام بوو. ئەبوهورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ، لەگەڵ گێڕانەوەکە وێنای ئەو دیمەنەی بۆ دەکردین و پەنجەی شەهادەی خستبووە دەمی و وەکوو ئاماژەیەک بۆ منداڵەکە پەنجەی خۆی دەمژی، دواتر ڕۆیشتن و بە لای خزمەتکارێکدا تێپەڕیین، کە خەڵکی لێیان دەدا و جنێویان پێ دەدا. پێیان دەگوت: هەی دزی داوێنپیس. ئینجا دایکی زۆری پێ ناخۆش بوو و گوتی: خوایە! منداڵەکەم وەک ئەو ژنە ڕسوا و بەدبەخت مەکە. منداڵەکە یەکسەر دەمی لە مەمکی دایکی کردەوە و چاوێکی لە ژنە خزمەتکارەکە کرد، ئەمجا گوتی: خوایە! وەکوو ئەو ئافرەتەم لێ بکە. ئینجا دایکی سەری سوڕما و بە منداڵەکەی گوت: ئێمە بە لای ئەو سوارچاکە پیاوچاکەدا ڕۆیشتین و من گوتم: خوایە! کوڕەکەم وەکوو ئەو پیاوە لێ بکە، بەڵام تۆ گوتت: خوایە! وەکوو ئەو پیاوەم لێ مەکە، ئێستا بە لای ئەو ژنە خزمەتکارە دز و داوێنپیسەدا ڕۆیشتین و گوتم: خوایە! کوڕەکەم وەکوو ئەو ژنە لێ مەکە. کەچی تۆ گوتت: خوایە! وەکوو ئەو ژنەم لێ بکە.

بـۆچی بە پـێچەوانەی مـن قسـەت کـرد و بەو شـێوازە لە خـوا پاڕایەوە؟ ئینجا منداڵەکە جوابی دایەوە و گوتی: ئەو پیاوەی تۆ پێت وابوو کەسێکی باشە و دووعات بۆ کردم کە وەک ئەوم لـێ بـێ، ئەوە پیـاوێکی ستەمکار و پیـاوکوژە. ئەو ژنە خزمەتکـارەش کە خەڵـک لێیـان دەدا و پێیـان دەگـوت: دز و داوێنپـیس، ئەوە ئافرەتێکی پاکە و نە دزی کردووە و نە داوێنپیسـی. هەر بۆیەش گوتم خودایە وەک ئەو ئافرەتەم لێ بکە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

# چیرۆکی هەشتەم

## مووسا و فریشتەی گیانکێشان.

له ئەبوهورەیرەەوه خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوه کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ((فریشتەی گیانکێشان هاتە لای مووسا سەلامی خوای لێ بێ و گوتی: ئەی مووسا! بە دەم داوای خوای گەورەوە وەرە و وەڵامی بدەوە. واتە: هاتووم بۆ گیانکێشانت. مووسا! تورە بوو و مستێکی لێ دا چاوێکی دەرپەڕاند. فریشتەی گیانکێشان بە چاوێکی دەرپەریوەوە گەڕایەوە لای خوا و گوتی: خوایە گیان! تۆ منت بۆ لای کەسێک ناردووە کە نایەوێ بمرێ و چاوێکیشی دەرپەڕاندم. ئینجا خوای گەورە چاوی چاک کردەوە و پێی فەرموو: بگەڕێوە لای مووسا و پێی بڵێ: ئەگەر حەزت لە مردن نییە و بڕیارت داوە ژیان هەڵبژێری، ئەوا دەست بە پشتی گایەکدا بهێنە، چەند موو بە دەستتەوە هات ئەوەندە ساڵەی دیکە دەژیی. فریشتەکە گەڕایەوە لای مووسا و ئەوەی خوا فەرمانی پێ کردبوو، پێی ڕاگەیاند. پێی گوت: کە دەست بە پشتی گایەکەدا بێنێ و چەند موو بە دەستییەوە هات ئەوەندە ساڵەی دیکە دەژیی. ئینجا مووسا گوتی: ئەی دوای ئەو چەند ساڵە چیم بەسەر دێ؟ فریشتەکە گوتی: دەمرییت. مووسا گوتی: کەوایە هەر ئێستا گیانم بکێشە. دواتر دەستی بەرز کردەوە و لە خوا پاڕایەوە، فەرمووی: پەروەردگار! نزیکی (بیت المقدس) زەویی پیرۆز گیانم بکێشە و با گۆڕەکەم لە ئەندازەی(رمیة الحجر) هاویشتنێکی بەردێک لە زەویی پیرۆز دوورتر نەبێ)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

## چیرۆکی نۆیەم

**خۆشردنی مووسا و هەڵاتنی بەردەکە.**

لە ئەبوهورەیرەەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: (( لەناو نەوەی ئیسرائیلیان وا باو بوو بە کۆمەڵ خۆیان دەشرد و زۆر بە ئاسایی سەیری داوێنی یەکتریان دەکرد، بەڵام حەزرەتی مووسا دوور لەوان و بە تەنیا خۆی دەشرد. نەوەی ئیسرائیلیەکان لەناو خۆیاندا دەیان گوت: مووسا بۆچی لەگەڵ ئێمە خۆی ناشوا؟! دیارە کێشەیەک لە داوێنیدا هەیە. ڕۆژێکیان مووسا چوو خۆی بشوات، جلەکانی لەسەر بەردێک دانا و دواتر ڕۆیشتە ناو ئاو تا خۆی بشوات. کاتێک لە خۆشردن تەواو بوو، سەیری کرد وەکوو بڵێی بەردەکە زیندوو بێ، جلەکانی بردووە و دووری خستونەتەوە. مووسا تووڕە بوو و هاواری کرد: ( ثوبی حجر، ثوبی حجر) واتە: ئەی بەرد جلەکانم، ئەی بەرد جلەکانم. حەزرەتی مووسا بە پەلە ڕای کرد بە ئاڕاستەی بەردەکە و دوای کەوت تا ئەو کاتەی نەوەی ئیسرائیلیەکان داوێنی مووسایان دیت. ئینجا گوتیان: بە ڕاستی داوێنی مووسا هیچ کێشەیەکی نییە. دواتر حەزرەتی مووسا گەیشت بە بەردەکە و جلەکانی هەڵگرت و بەتووڕەییەوە چەند جارێک لە بەردەکەی دا. لە خەفەتی ئەوەی کە بەردەکە بووە هۆکاری ئەوەی داوێنی مووسا دەرکەوێت و نەوەی ئیسرائیلیەکان ببینن. ئینجا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە دەفەرموێ:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴿٦٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٦٩

واته: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بە موحەدمەد هێناوە، ئێوە وەکوو ئەوانە (نەوەی ئیسرائیلیەکان) مەبن کە بە تۆمەت و بوختانی نابەجێ ئازاری پێغەمبەر مووسایان دا. خوای گەورەش مووسای بەریی کرد لەو تۆمەت و قسە نابەجێیانەی ئەوان، بە ڕاستی مووسا لای خوا زۆر بەڕێزە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

## چیرۆکی دەیەم

**ئادەم و فریشتەی گیانکێشان.**

لە ئەبوهورەیرەەوە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێ کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: (( کاتێک خوای گەورە ئادەمی درووست کرد مەسحی پشتی کرد و دواتر هەموو ئەو مرۆڤانەی کە خوای گەورە لە پشتی ئادەمەوە درووستی کردبوون، کەوتنە خوارەوە و رووخساریان کەوتە بەرچاوی ئادەم (علیە سلام) دواتر لە نێوچاوانی هەموو ئینسانێک ڕووناکییەکی درەوشاوەی دانا و دواتر پیشانی حەزرەتی ئادەمی دان. ئادەم پرسیی: پەروەردگارا ئەوانە کێن؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەوانە نەوە و وەچەی تۆن. ڕووناکیی ناوچەوانی یەکێک لەو کەسانەی پیشانی درا، زۆر سەرنجی ڕاکێشا! بۆیە دووبارە پرسیی: ئەی پەروەردگار ئەو کەسە کێیە؟ خوای گەورە وەڵامی دایەوە و فەرمووی: ئەوە یەکێکە لە نەوەکانت. ناوی داودە و لە کۆتا گەلەکان دەردەکەوێ. ئینجا ئادەم دووبارە پرسیی: ئەی چەند ساڵ تەمەنیەتی، واتە: چەند ساڵ دەژیی؟ خوای گەورە فەرمووی: شەست ساڵ تەمەنیەتی. ئادەم گوتی: خوایە چل ساڵ لە تەمەنی من کەم بکەوە و بیخە سەر تەمەنی داود. ئینجا دوای ئەوەی ئادەم ماوەی تەمەنی خۆی ژیا و تەمەنی کۆتایی هات، فریشتەی گیانکێشان هاتە لای و گوتی: هاتووم گیانت بکێشم. ئادەم پرسیی: ئەی چل ساڵ لە تەمەنم نەماوە؟ فریشتەکە پێی گوت: ئەی چل ساڵت نەدا بە داودی کوڕت؟ ئینجا ئادەم هەر ئینکاریی کرد و ئێستاش

نەوەکانی ئادەم بە هەمان شێوە ئینکاری دەکەن. ئادەم لەبیری چوویەوە و ئێستاس نەوەکانی لەبیریان دەچێتەوە. ئادەم هەڵەی کرد و ئێستاش نەوەکانی هەڵە دەکەن. ئەو سیفەتانە بوون بە بەشێک لە نەوەکانی ئادەم تا قیامەت)).

هذا حديث صحيح اخرجه الترمذي و ابن سعد في الطبقات و الحاكم و صححه و وافقه الذهبي .

## چیرۆکی یازدەهەم

### ئەو بازرگانەی کە بە کۆلکە دارەکەدا پارەکەی ناردەوە.

ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرمـــوویەتی:(( بازرگـــانێکی نەوەی ئیســـرائیل داوای قەرزی لە پیاوێکی دیکە کرد و گوتی: ئەی بەندەی خوا هاتووم پێویستم بە بڕێـــک پـــارەیە ســـەفەرێکی بازرگـــانی دەکەم و هەرکاتێـــک لە سەفەرەکە هاتمەوە، پارەکەت بۆ دەگەڕێنمەوە. کابرای قەرزدەر گوتی: شاهیدێک بێنە کە ئاگای لێ بێت من قەرزم داوە بە تۆ. کابرای بازرگان گوتی: خودا بەسە کە شاهید بێ لە نێوانمان. کـــابرای قەرزدەر گـــوتی: کەفیلێـــک بێـــنە تـــا ئەگەر پـــارەکەت نەگەڕاندەوە، ئەو لە جیاتی تۆ پارەکەم بداتەوە. کابرای بازرگان گوتی: خودا بەسە تا کەفیل و پشت و پەنام بێ. کابرا ڕازی بوو و قەرزەکەی دایە. ماوەیەکیان دیاری کرد کە دەبێ لەو ماوەیەدا قەرزەکە بێنێتەوە. بەو شێوەیە ڕێککەوتن و کابرا بەڕێ کەوت بۆ سەفەرەکەی، کە سەفەرەکەی بە دەریادا بوو. دوای ئەوەی گەشـــتەکەی کۆتـــایی هـــات و کارەکـــانی تەواو بـــوون، ویســـتی بگەڕێـــتەوە بـــۆ ئەوەی لە مـــاوەی خۆیـــدا قەرزەکە بـــداتەوە بەو کەسەی کە قەرزەکەی لێ وەرگرتبوو. هـاتە کەنار دەریا زۆر چاوی گێڕا هیچ بەلەمێکی دەست نەکەوت. ناچار کۆلکە دارێکی هێنـا و نـاوەکەی کـۆڵی و هەزار دینـاری خسـتە نـاوی. پـارچە کاغەزێک و قەڵەمێکیشـی هێنا و نـامەیەکی بـۆ کـابرا نووسـی و ئەویشی خستە ناو کۆلکە دارەکە. دواتر دەستی بەرز کردەوە و لە خودا پاڕایەوە و گوتی: خوایە! کاتێک ئەو قەرزەم لەو کابرایە

وەرگرت داوای شاهیدی لێ کردم، من تۆم کرد بە شاهید. داوای کەفیلی لێ کردم، من تۆم کرد بە کەفیل و پشت و پەنا. ئێستاش هەموو هەوڵێکم دا بۆ ئەوەی بەلەمێک ببینمەوە و پێی بگەڕێمەوە، بەڵام دەستم نەکەوت. خوایە! من ئەو کارەم بە تۆ دەسپێرم داوات لێ دەکەم ئەو پارە و نامەیە بگەیەنیتەوە دەست ئەو پیاوە و شەرمەزارم نەکەی. ئینجا کابرا دارەکەی خستە ناو بەحرەکەوە هەتا لەبەر چاوی ون بوو. کابرای قەرزدەریش لەوسەرەوە هاتبووە قەراخی دەریایەکە و چاوەڕێی ئەوە بوو قەرزەکەی بۆ بێتەوە. زۆری چاوەڕێ کرد کابرا هیچ سۆراخی نەبوو. کۆلکەدارێکی لە قەراغ ئاوەکە بەدی کرد و بە مەبەستی گەرمکردنەوەی خۆی و ماڵ و منداڵی، هەڵی گرتەوە و دواتر گەڕایەوە ماڵ. لە ماڵەوە کە کۆلکە دارەکەی دانا ئینجا سەیری کرد برێک پارە و نامەیەکیشی تێدایە. نامەکەی خوێندەوە، هیی ئەو کەسە بوو کە قەرزی پێدابوو و پارەکەش هەمان ئەو هەزار دینارە بوو، کە دابووی بە کابرای بازرگان. ئینجا هەر دوابەدوای ئەوە کابرای بازرگانیش هاتەوە و هەزار دیناری دیکەشی بۆ هێنایەوە و گوتی: بە ڕاستی داوای لێبووردن دەکەم زۆر هەوڵم دا، تا ئێستاش بەلەمێکم دەست نەکەوت کە پێی بێمەوە و لە کاتی خۆیدا قەرزەکەت بدەمەوە. فەرموو ئەوەش ئەو هەزار دینارەیە کە پێت دابووم. کابرا سەری سوڕما و پرسیی: ئەی پێش خۆت هیچی ترت بۆ نەناردبووم؟ کابرای بازرگان نەیزانی کە کابرا کۆلکەدارەکەی هەڵگرتۆتەوە و پارەکەی دەرهێناوە. گوتی: من تازە بەلەمێکم دەست کەوت چۆن بە چیدا بۆت بنێرمەوە؟ کابرای قەرزدەر گوتی: دە ئەوە خوای گەورە لە جیاتی تۆ قەرزەکەی دایەوە و بەو شێوەیە

پارەکە گەیشتەوە دەستم. ئێستاش ئەو هەزار دینارە هەڵگرەوە و ئەوە هئی خۆتە. ئینجا بازرگانەکە پارەکەی هەڵگرت و سوپاسی کابرای کرد)).

هذا حديث صحيح ، اخرجه البخارى واحمد في مسنده .

# چیرۆکی دوازدەهەم

## حەزرەتی عیسا و ئەو پیاوەی دزیی کرد.

ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((ڕۆژێکیان حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم چاوی بە پیاوێک کەوت دزیی دەکرد. عیسا یەکسەر گوتی: ئەوە دزییت کرد؟ کابرا ڕووی کردە عیسا و گوتی: نەخێر، سوێند بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لەو. ئینجا عیسا کە دیتیی کابرا سوێندی خوارد، پەشیمان بوویەوە و گوتی: باوەڕم بە خوا هێنا و خۆمم بە درۆ خستەوە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

# چیرۆکی سێزدەهەم

## ئەو پیاوەی لە بەهەشت کشتوکاڵ دەکات.

ئەبوهـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەر سـەلامی خـوای لەسـەر بـێ فەرمـوویەتی:(( لە ڕۆژی دواییـدا پیاوێـک لە ئەهلـی بەهەشـت داوا لە خـوا دەکـات کە ڕێـگەی بـدا کشـتوکاڵ و زەراعەت بکـا، خـوای گەورەش پێـی دەفەرمـووێ: بەندەکەم! ئەی من هەموو شتێکم پێ نەداوی؟ کابرا دەڵێت: بەڵێ پەروەردگار! بەڵام من حەزم لە کشتوکاڵە. ئینجا خوا ئیزنـی دا و کابرا زەویـی کێڵا و تۆوی پێدا کرد. بە فەرمـانی خـوا یەکسـەر کشـتوکاڵەکەی پێگەیشـت و بـاڵای بەقەد چیاکـان بەرزبـوویەوە و کـاتی دروونەوەشـی هـات. ئینجـا خـوا پێـی فەرمـوو: فەرمـوو! بە ڕاستی نەوەی ئادەم بە هیچ شتێک چاوی پڕ نابێ)).

هـذا حـدیث صـحیح اخـرجه البخـاری فـی صـحیحه و احمـد فـی مسنده.

# چیرۆکی چواردەهەم

## ئەو پیاوەی خۆی کوشت و خواش بەهەشتی لێ حەرام کرد.

جوندبی بەجەلی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((پیاوێک لە گەلانی پێش ئێوە لە شەڕێک لە شەڕەکاندا بریندار بوو. برینەکە ئەوەندە ئازاری دا کە کابرا نەیتوانی لەوە زیاتر نەیتوانی بەرگەی بگرێ. بۆیە تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا و بە نووکی تیرەکەی، برینەکەی پێ هەڵکۆڵی هەتا برینەکەی قووڵ بوو و بەو هۆیەوە وەفاتی کرد. ئینجا خوا فەرمووی: ئەو بەندەیەم پەلەی کرد لە گەیشتن بە من، بۆیە منیش بەهەشتی لێ حەرام دەکەم)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

## چیرۆکی پازدەهەم

**ئەو پیاوەی بە کوڕەکانی گوت ئەگەر مردم بمسووتێنن.**

ئەبوهـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی:(( پیاوێک لە گەلانی پێش ئێـوە تـاوانی زۆر کردبـوو، پـێش ئەوەی بمـرێ وەسـیەتی بـۆ کوڕەکانی کرد و گوتی: کاتێک مردم جەستەکەم بسـووتێنن و وردوخاشـی بـکەن. ئینجـا بە هەوادا بـڵاوی بـکەنەوە. چـونکە وەڵڵاهی ئەگەر ئاوا بەو هەموو تاوانەوە بگەڕێمەوە لای خوا، بە شێوەیەک سزام دەدا کە هیچ کەسێک پێشتر بەو شێوەیە سزا نەدرابـێ. کـابرا مـرد و کوڕەکـانی وەک ئەوەی بابیـان پێـی گوتبوون کردیان. ئینجا خوا فەرمانی بە زەوی کرد کە گەرد و تۆزی ئەو کابرایە کۆبکاتەوە، زەوییش فەرمانی خوای بەجێهێنا و کـابرا بە کـامڵی و بە شـێوازی پـێش مردنـی لەبەردەم خـوا وەستا. خوا پێی فەرموو: ئەی بەندەکەم بۆچی ئاوات کرد؟ کابرا گوتی: لە ترسی تۆ ئەی پەروەردگار! بۆیە خوا فەرمووی: مادام تـۆ ئەوەنـدە لە سـزا و تـووڕەیی مـن دەترسـی، دە ئەوە مـن لە تاوانەکانت خۆش بووم و بڕۆ بەهەشتەوە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

# چیرۆکی شازدەهەم

## کار ئاسانکردن لەسەر خەڵکی مرۆڤ بەرەو بەهەشت دەبات.

ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((لە سەردەمانی پێش ئێوە پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو، کە ئەوەی ناوی چاکە بێ نەیکردبوو، ئەو پیاوە خوویەکی باشی هەبوو قەرزی دەدا بە خەڵکی و بە خزمەتکارەکەی دەگوت: بڕۆ ئەوەی توانای هەبوو قەرزەکەی لێ وەربگرەوە، ئەوەشی توانای نەبوو ئەوە چاوپۆشی لێ بکە و زۆریی لێ مەکە، بەڵکوو بەو هۆیەوە خواش چاوپۆشی لە ئێمە بکات. کاتێک ئەو پیاوە مرد و گەڕایەوە لای خوا، خوا پێی فەرموو: تا ئێستا هیچ چاکەیەکت کردووە؟ کابرا گوتی: نەخێر ئەی پەروەردگار، تەنیا ئەوەبوو خزمەتکارێکم هەبوو و قەرزم دەدا بە خەڵکی، کاتێک کاتی دانەوەی قەرزەکان دەهات پێم دەگوت: بڕۆ ئەوەی توانای هەبوو لێی وەربگرەوە و ئەوەشی توانای نەبوو زۆریی لێ مەکە و چاوپۆشیی لێ بکە بەڵکوو بەو هۆیەوە خواش چاوپۆشی لە ئێمە بکات. ئینجا خوا پێی فەرموو: دەی ئەوە منیش چاوپۆشیم لێ کردی و لێت خۆش بووم)).

هذا حديث صحيح اخرجه النساءی و ابن حبان و حاكم

# چیرۆکی حەڤدەهەم

**ئەو تاوانبارەی چووە بەهەشت و ئەو پیاوە دیندارەی چووە دۆزەخ.**

ئەبوهـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەر سـەلامی خـوای لـێ بـێ فەرمـوویەتی :(( لە سـەردەمی نەوەی ئیسرائیلیەکاندا دوو هاوڕێ هەبوون، یەکیان بەردەوام خەریکی خواپەرستی و دینداری بوو، ئەوی دیکەیان تاوانبار و ئیهمال و سەرەڕۆ، جا ئەوەی دیندارەکە بەردەوام سەرزەنشت و لۆمەی ئەوی دیکەی دەکرد و پێی دەگوت: بەسە وازبهێنە لە تاوان و دەست هەڵگرە، هەتا ڕۆژێکیان کابرای تاوانباری لەسەر تاوانێک دیت و پێی گوت: بەسە دەست لە تاوان هەڵگرە، کابراش تووڕە بوو و گوتی: ئەرێ دە بەسە واز لە من بێنە خۆ تۆ لە لایەن خواوە نەکراوی بە چاودێر بەسەرمەوە؟! کابرای دیندار گوتی: من بۆ تۆمە و ئەگەر هەروا بەردەوام بی خوا لێت خۆش نابێ و ناچیە بەهەشت. دوای ئەوەی هەردووکیان وەفاتیان کرد و گەڕانەوە بەردەمی خوا، خوای گەورە ڕووی لە کابرای ئیماندار کرد و پێی فەرموو: تۆ چۆن لە جیاتی من بڕیار دەدەی و خەڵکی ڕەوانەی بەهەشت و دۆزەخ دەکەی؟ دواتر فەرمانی کرد ڕەوانەی دۆزەخی بکەن. دواتر ڕووی کردە کابرای تاوانبار و پێی فەرموو: ئەوە بە ڕەحم و بەخشندەیی خۆم لێت خۆش بووم و فەرمانی بە فریشتەکانی کرد کە بیبەنە بەهەشت)).

هذا حديث صحيح اخرجه ابو داود واحمد .

# چیرۆکی هەژدەهەم

**ئەو دوو ژنەی کێشـــەیەکیان بـــردە لای حەزرەتـــی داود و سولەیمانی کوڕی.**

ئەبوهـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی :(( لەناو نەوەی ئیسرایلیەکان و لە سـەردەمی پێغەمبەرایەتیی داود و سـولەیمانی کوڕیدا دوو ئافرەت هەبوون کە یەکیان باڵابەرز بوو و ئەوی دیکە کورتەباڵا بوو. لەسەر ئەوەی کە گورگ منداڵی یەکێکیانی برد لێیان بوو بە کێشـە، هەر یەکەیـان بەوی دیـکەی دەگـوت کە گـورگ منـداڵەی تۆی بردووە و ئەوەی مـاوەتەوە هیـی منە. هەردوو منـداڵەکەش سـاوا بـوون، ئینجـا بڕیاریانـدا بـڕۆن بـۆ لای حەزرەتی داود بـۆ ئەوەی کێشـــەکەیان بـــۆ چارەســـەر بکـــا، داود کە بینـــی ژنە بـاڵابەرزەکە دەگریـا و دەپـاڕێتەوە یەکســەر بڕیـاری دا کە ئەو منداڵە بدەن بەو ژنە باڵا بەرزە و منداڵەکە هیی ئەوە. دواتر کە ڕۆیشتنەوە لە ڕێگە حەزرەتی سولەیمانی کوڕی داودیان دیت و کێشـــەکەیان بـــۆ ئەویـــش بـــاس کـــرد، حەزرەتـــی ســـولەیمان فەرمووی: ئەو منداڵەی ماوە بۆم بێنن و چەقۆیەکیشم بۆ بێنن، گوتیان: دەتەوێ چی لێ بکەی؟ گوتی: دەمەوێ بیکەمە دوو لەت و هەر یەکەتـان پـارچەیەک هەڵگـرن، ئینجـا ژنە کورتەبـاڵاکە دەستی کرد بە گریان و لە سولەیمان پاڕایەوە کە منداڵەکە هی ئەو نییە و هیی ئەو ژنە باڵابەرزەیە. سولەیمان کە ئەوەی بینی یەکسەر زانی ئەوە دایکی ڕاستەقینەی منداڵەکەیە، بۆیە فەرمـانی کرد منداڵەکە بدەن بەو ژنە کورتەباڵایە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

## نۆزدەهەم

**ئافرەتە کورتەکە و دوو ئافرەتی بالأبەرز.**

ئەبوسەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی :(( ڕۆژێکیان ئافرەتێکی کورتەبالآی نەوەی ئیسرائیلی لەگەل دوو ئافرەتی دیکە بە ڕێگەدا دەڕۆیشت، لە ڕێگەدا لەپڕ لێیان ون بوو. ڕۆیشت جووتێک پێلاوی تەختەی بەرزی لە پێ کرد لەگەڵ ئەنگوستیلەیەکی زێڕ و بۆنی میسکی لە خۆی دا، کە یەکێکە لە خۆشترین بۆنەکان. ئینجا گەڕایەوە و خۆی گەیاندەوە دوو ئافرەتەکەی دیکە، کاتێک دیتیان ئەوەندە خۆی تیف تیفە دابوو و شکڵی خۆی گۆڕیبوو، کە دوو ئافرەتەکەی هاوڕێی نەیان ناسییەوە. ئینجا ئەو ئافرەتە مەکربازە بە دەستی و بە مەکرونازەوە ئیشارەتێکی بۆ کردن یانی خۆمم بمناسنەوە)).

هذا حديث صحيح ، اخرجه مسلم

# چیرۆکی بیستەم

## حەزرەتی سولەیمان و سێ داوایەکەی لە پەروەردگار.

عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: (( ئەو کاتەی سولەیمانی کوڕی داود (بیت المقدس)ی درووست کرد، داوای سێ شتی لە خوا کرد: داوای لە خوا کرد کە دانایی پێ ببەخشێ و خوا ئەوەیانی پێدا. داوای ئەوەی کرد دەسەڵاتێکی پێ بدا، کە لە دوای ئەو نەیدا بە هیچ کەسێکی دیکە. خوا ئەوەشیانی پێدا. ئینجا داوای ئەوەی کرد هەرکەسێک هاتە ناو (بیت المقدس) و نوێژی تێدا کرد بە شێوەیەک پاک ببێتەوە لە تاوان کە وەکوو منداڵێکی ساوای لێ بێتەوە. خوا دوو داوایەکەی سەرەتای قبووڵ کرد و هیوام وایە ئەوەی سێیەمیشی قبووڵ کردبێ)) .

حذا حديث صحيح ، اخرجه النسائي ،و ابن ماجه و احمد و ابن حبان و حاكم .

## بیستویەک

**قسەکردنی ئاژەڵان.**

ئەبوهـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەر سەلامی خوای لـێ بێ فەرموویەتی: (( کاتێک شـوانێک خەریکی لەوەڕانـدنی مەڕەکـانی بـوو، لەپـڕ گـورگ هێرشـی بـۆ هێنـا و مەڕێکـی فڕانـد. شـوانەکە دوای کەوت و لە ڕێـگەدا گـورگەکە ئاوڕی دایەوە و بە شوانەکەی گوت: کاتێک خۆت لای مەڕەکان نییت کێ ئاگای لە مەڕەکانت دەبێ؟ ڕۆژێکیشیان پیاوێک باری لە مانگایەکەی بارکردبوو و پێشی خۆی دابوو، مانگایەکە ئاوڕی دایەوە و گوتی: بە ڕاستی من بۆ ئەوە درووست نەکراوم بارم لێ بنێی بەڵکوو بۆ زەویکێڵان درووست کراوم. ئینجا خەڵکەکە کە بینیـان مانگـاکە قسـەی کـرد هەمـوو گوتیـان "سـبحان اللـه" پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ دەفەرمووێ: من و ئەبوبەکر و عومەر باوەڕمان بەو ڕووداوانە هەیە)) .

هذا حديث صحيح متفق عليه .

## بیستودوو

## ئەو پیاوەی خێری بە داوێنپیس و دز و دەوڵەمەندێک کرد.

ئەبوهـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەر سـەلامی خـوای لـێ بـێ فەرمـوویەتی : ((لە سـەردەمی نەوەی ئیسرائیلیەکاندا پیاوێک بڕیاری دا خێرێک بکات و گوتی: ئەمشـەو دەبێ خێرێک بکەم. شەو هات و کابرا خێرەکەی کرد. بۆ بەیانی دەرکەوت ئەو کەسـەی ئەو پیـاوە خێـری پێ کـردووە دز بـووە. خەڵـک هەمـوو لەنـاو خۆیانـدا بە گـاڵتەوە باسـیان دەکـرد و دەیانگوت: ئەمشەو خێر بە دزێک کراوە. ئینجا کابرای خێرۆمەند گوتی: خوایە بۆ خۆت دەزانی من بە نیەتێکی پاکەوە ئەو خێرەم کردووە، بەڵام وا خەڵک بە گاڵتەوە دەڵێن ئەمشەو خێر بە دزێک کراوە. ڕۆژی دواتر دووبارە بڕیاری دا خێرێک بکا. شـەو خێری کـرد و بەیـانی لەنـاو خەڵـک بڵاوبـوویەوە کە ئەمشـەو خێـر بە ژنەزیناکەرێک کراوە. کابرا دووبـارە ئاهـ و حەسرەتی هەڵکێشـا و گوتی: خوایە! زۆر حەمد و سەنا بۆ تۆ، خێرم کرد و خێرەکە بۆ زیناکەرێک بوو. ڕۆژی دواتر دووبارە بڕیاری دا خێرێک بکا. ئەو شـــەوەش خێـــرەکەی کـــرد و بـــۆ بەیـــانی لەنـــاو خەڵـــک بڵاوبـوویەوە کە ئەمشــەو خێـر بە دەوڵەمەنـدێک کـراوە. کـابرا دووبـــارە غەم و پەژارە دایگـــرت و گـــوتی: خـــودایە! خێـــری ئەمشەویشـم بـۆ دەوڵەمەندێک بـوو، مـن وا سـێ شـەوە لەسـەر یەک خێر دەکەم، جارێک بۆ دز و جارێک بۆ زیناکەر و جارێک بـۆ دەوڵەمەنـد بـوو. پاشـان لە لایەن خـواوە پێی ڕاگەیەنـدرا کە پێویست ناکا غەم و پەژارە داتبگرێ تۆ خێرو چاکەی خۆت کرد

و لای خـوا ون نابێـت. لەوانەشــە بە هـۆی ئەو خێـرەی تـۆوە دزەکە بیــر بکــاتەوە و واز لە دزی بێنــێ، زینــاکەرەکەش بەو هـۆیەوە واز لە زینـا بهێنێـت و تەوبە بکـات، دەوڵەمەنـدەکەش بە هەمان شێوە لەوانەیە لەمەودوا بەخۆیدا بچێتەوە و بەشـێک لەو سەروەت و سامانەی هەیەتی ببەخشێتە هەژار و نەداران)).

**هذا حديث صحيح متفق عليه**

## بیستوسێ

**سولەیمان و چوونە لای ژنەکانی.**

ئەبوهـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەر سـەلامی خـوای لـێ بێ فەرمـوویەتی: ((سـولەیمانی کـوڕی داود گـوتی: ئەمشـەو دەبـێ بـڕۆمە لای سـەد ژن بەو هیـوایەی هەر یەکەیـان سـوارچاکێک بـخەنەوە کە لە ڕێگەی خـودادا تێبکۆشـێ. لەو کـاتەدا یەکێک لە هاوڕێکانی پێی گـوت: ئەی سـولەیمان بڵێ "ان شـاء الـلە" بەڵام سـولەیمان نەیگـوت "ان شـاء الـلە". ئینجـا ڕۆیشـت و سـەرجێی لەگەڵ هەر سـەد ژنەکەی کـرد بەڵام لەو سـەد ژنە تەنیـا یەک دانەیـان سـکپڕ بـوو ئەویـش منـداڵێکی پەککەوتەی بـوو. پێغەمـبەر دەفەرمـووێ: سـوێن بە خـوا ئەگەر بیگوتـایە "ان شـاء الله" ئەوە خـوا نائومێـدی نەدەکـرد و ئەوەی ویستبای بۆی جێبەجێ دەکرد)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

# بیستوچوار

## پێغەمبەر و جنۆکەیەک کە ویستی نوێژەکەی پێ ببڕێ.

ئەبوهـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ((دوێنێ جنۆکەیەک لە کاتی نـوێژدا بەرەو ڕووم هـات و ویسـتی نـوێژەکەم لـێ تێـک بـدات، بەڵام خوای گەورە وای کرد کە توانیم بەسەریدا زاڵ بم. ویسـتم بیگـرم و بە یەکێـک لە کۆڵەکەکـانی مـزگەوتەوە ببیەسـتمەوە تـا ئێـوەش بـێن و ببیـنن، بەڵام ئەو فەرمایشـتەی سـولەیمانی بـرام بیـر کەوتەوە، کە لە خـوا پـاڕایەوە و فەرمـووی: خـوایە! لـێم خۆشـبە و دەسـەڵاتێکم پـێ ببەخشـە کە لە دوای مـن نەیدەی بە کەسـی دیـکە لە بەنـدەکانت. ئینجـا جـنەکەم ئـازاد کـرد و بە سەرشۆڕی ڕای کرد و لەبەر چاوان ون بوو)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

## بیست و پێنج

### شەیتان و شاگردانی و نزیکترین کەس لێوەی.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((ئیبلیس تەختی پادشایەتی خۆی لەسەر ئاو دادەنێ و ئینجا شاگردانی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەکاتەوە بۆ نانەوەی فیتنەو ئاژاوە، کامیان لە هەموویان زیاتر فیتنەو ئاژاوە بنێتەوە لە هەموویان خۆشەویستتر و نزیکتر دەبێ لێی، شاگردەکانی دانە بە دانە دێنەوە بۆ لای و کارە خراپەکانی خۆیان باس دەکەن بە هەموویان دەڵێ برۆن ئێوە هیچی واتان نەکردووە، هەتا ئەو کاتەی یەکێکیان دێت و دەڵێت: وازم نەهێنا هەتا ژن و پیاوێکم لێک جیاکردەوە، ئینجا شەیتان لە خۆی نزیک دەکاتەوەو پێی دەڵێت: ئافەرین تۆ لە هەموویان باشتریت)).

هذا حدیث صحیح اخرجه مسلم و احمد

# بیستوشەش

## حەزرەتی ئەییوب و خۆشوردنی بە ڕووتی.

لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێرنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((لە کاتێکدا حەزرەتی ئەییوب خەریکی خۆشوردن بوو، جۆرە کوللەیەک لە ئاڵتوون بەسەریدا باری. ئەییوب کە ئەو کوللەزێڕانەی بینی، یەکسەر کەوتە کۆکردنەوەیان و بە خێرایی دەیخستنە ناو جلەکانی. لەو کاتەدا خوای گەورە بانگی کرد: ئەی ئەییوب! ئەوە چی دەکەی؟ ئەی من بێنیاز و دەوڵەمەندم نەکردووی لە ڕسق و ڕۆزیی خۆم؟ چ پێویستت بەوەیە کوللە خرکەیەوە؟ ئەییوب وڵامی دایەوە و گوتی: بەڵێ، سوێند بە عەزەمەت و گەورەییت ئەی پەروەردگار تۆ هەموو شتێکت پێ بەخشیوم، بەڵام ناشتوانم دەست لە نیعمەت و بەرەکەتت هەڵگرم)).

هذا حدیث صحیح اخرجە بخاری والنسائی و احمد

## بیستوحەوت

### هەورێک بە فەرمانی خوا ئاو دەڕژێنێتە زەویی پیاوێک.

لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((کاتێک پیاوێک بەناو کۆمەڵێک زەویدا ڕێی دەکرد، لەپڕ گوێی لە دەنگێک بوو فەرمانی بە پەڵەهەورێک کرد کە بچێ زەویی فلانە کەس ئاوبدا. کابرا سەرنجی دا هەورەکە جووڵا و ڕۆیشت لەسەر پارچە زەوییەک ئاوەکەی هەڵڕشت. پیاوەکە بە دوای پەڵە هەورەکەدا ڕۆیشت هەتا ئەو زەوییەی دیتەوە کە پەڵە هەورەکە ئاوەکەی لێ ڕشتبوو، کاتێک گەیشتە زەوییەکە پیاوێکی دیت لەناو زەوییەکەدا وا خەریکە ئاوی ناو زەوییەکە بە بێڵ[٣] دابەش دەکات. ئینجا پرسیاری کرد: ئەی بەندەی خوا ناوت چییە؟ کابرا وڵامی دایەوە و گوتی: ناوم فلانە کەسە. هەمان ئەو ناوەی لەو دەنگەوە گوێی لێ بوو، کە فەرمانی بە پەڵەهەورەکە کرد. ئینجا کابرای خاوەن زەوی گوتی: بۆچی لە ناوم دەپرسیی براکەم؟ کابراش وەڵامی دایەوە و گوتی: بۆیە پرسیم چونکە گوێم لە دەنگێک بوو کە فەرمانی بە پەڵەهەورێک کرد بێت زەویی تۆ ئاوبدا. تۆ چیی لەو زەویەدا دەچێنی کە وای کردووە خوا بەو شێوەیە فەرمان بە هەور بکات بێت زەویی تۆ ئاوبدات؟ کابرا وڵامی دایەوە و گوتی: من بەرهەمی ئەو زەوییە دەکەمە سێ بەش، بەشێکیان لە ڕێی خوادا دەبەخشم، بەشێکی بۆ خۆم و

---

[٣] بێڵ: پیمەڕە، خاکەناز.

خێـزانەکەم تەرخـان دەکەم، بەشـەکەی دیـکەش لە زەویـیەکەدا خەرج دەکەمەوە)).

**هذا حديث صحيح اخرجه مسلم و احمد**

## بیستوهەشت

**ئەو پێغەمبەرەی شارە مێرووولەیەکی سووتاند.**

لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((جارێکیان مێرووولەیەک قاچی پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرانی گەست. ئەو پێغەمبەرە تووڕە بوو و فەرمانی کرد ئەو شارە مێرووولەیە بسووتێنن. یەکسەر خوای گەورە وەحی بۆ کرد و سەرزەنشتی کرد، پێی فەرموو: لەسەر ئەوەی مێرووولەیەک گازی لێ گرتی، شارە مێرووولەیەکت سووتاند کە تەسبیحاتی خوایان دەکرد؟!)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

## بیستونۆ

### لەتکردنی سنگی پێغەمبەر و ئیسڕا و میعراج.

لە مالیکی کوڕی ((صعصع))ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((کاتێک من لە دەرەوەی کەعبەدا پاڵم دابوویەوە، لەپڕ جوبرائیل هاتە لام و سنگی لەت کردم و دڵی دەرهێنام، پاشان تەشتێکی زێڕی پڕ لە ئیمانی هێنا و بە ئاوی زەمزەم دڵی شوشتم و پڕی کرد لە ئیمان و دانایی. دواتر خستییەوە شوێنی خۆی و سنگمی پێکەوە نایەوە، ئینجا ئاژەڵێکی سپیی بۆ هێنام کە لە گوێدرێژ گەورەتر و لە ئێستر بچوکتر بوو، پێی دەوترا "بوراق". دواتر سواری ئەو بوراقە بووم. ئەو بوراقە ئەوەندە خێرابوو هەتا چاو بڕ بکا پێی دادەنا لە کاتی ڕۆیشتندا، لەگەڵ جوبرائیل بەڕێ کەوتین هەتا گەیشتینە ئاسمانی یەکەم. واتە: ئاسمانی دونیا. لە دەرگامان دا و وەڵامیان دایەوە گوتیان: کێیە؟ جوبرائیل گوتی: منم جوبرائیل. پرسیاریان کرد کێت لەگەڵە؟ جوبرائیل گوتی: موحەممدم لەگەڵە. پرسیاریان کرد ئایا ڕەوانە کراوە بۆ لای گەلەکەی؟ جوبرائیل گوتی: بەڵێ. ئینجا گوتیان: ئەک بەخێربێن، فەرموون وەرنە ژوورەوە. کاتێک چووینە ژوورەوە حەزرەتی ئادەممان دیت. جوبرائیل گوتی: ئەوە ئادەمی باوکتە سەلامی لێ بکە. ئینجا منیش سەلامم لێ کرد و حەزرەتی ئادەمیش جوابی سەلامەکەی دامەوە و فەرمووی: سلاو لە پێغەمبەری سالح و کوڕی سالحم. پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی دووەم. لە دەرگامن دا و وەڵامیان دایەوە گوتیان: کێیە؟ جوبرائیل گوتی: منم جوبرائیل. پرسیاریان

کرد: کێت لەگەڵە؟ جوبرائیل گوتی: موحەممەدم لەگەڵە. پرسییان: ئایا ڕەوانە کراوە بۆ لای گەلەکەی؟ جوبرائیل گوتی: بەڵێ، ئینجا گوتیــان ئەک بەخێــربێن و فەرمــوون وەرنە ژوورەوە. کاتێــک چووینە ژوورەوە، حەزرەتی عیسا و حەزرەتی یەحیامان دیت کە کوڕەپووری یەکترن. دواتر جوبرائیل گوتی: ئەوە حەزرەتی عیسا و حەزرەتــی یەحیــان ســەلامیان لــێ بــکە. ئینجا منیش سەلامم لێ کردن و ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و گوتیان: سڵاو لە پێغەمبەری ساڵح و برای ساڵحمان. پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی سێیەم. لە دەرگامن دا و وەڵامیان دایەوە گوتیان: کێیە؟ جوبرائیل گوتی: منم جوبرائیل. پرسیاریان کرد: کێت لەگەڵە؟ جوبرائیل گوتی: موحەممەدم لەگەڵە، پرسیاریان کرد ئایا ڕەوانە کراوە بۆ لای گەلەکەی؟ جوبرائیل گوتی: بەڵێ. ئینجا گوتیان ئەک بەخێــربێن و فەرمــوون وەرنە ژوورەوە. کاتێــک چــوینە ژوورەوە حەزرەتی یووسفمان دیت، ئەمجا جوبرائیل گوتی: ئەوە حەزرەتی یووسفە، سەلامی لێ بکە. ئینجا منیش سەلامم لێ کرد. ئەویش وەڵامی دایەوە و گوتی: سڵاو لە پێغەمبەری ساڵح و برای ساڵحم. پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی چوارەم، لە دەرگامن دا و وەڵامیان دایەوە گوتیان: کێیە؟ جوبرائیل گوتی: منم جوبرائیل. پرسیاریان کرد کێت لەگەڵە؟ جوبرائیل گوتی: موحەممەدم لەگەڵە. پرسیاریان کرد ئایا ڕەوانە کراوە بۆ لای گەلەکەی؟ جوبرائیل گوتی: بەڵێ، ئینجا گوتیان: ئەک بەخێربێن و فەرموون وەرنە ژوورەوە. کاتێک چووینە ژوورەوە حەزرەتی ئیدریسمان دیت. جوبرائیل گوتی: ئەوە حەزرەتی ئیدریسە سەلامی لێ بکە. ئینجا منیش سەلامم لێ کرد. ئەویش وەڵامی دایەوە و گوتی: سڵاو لە پێغەمبەری ساڵح و برای ساڵحم.

پاشـان بەرزکـراینەوە بـۆ ئاسـمانی پێـنجەم. لە دەرگـامن دا و وەڵامیـان دایەوە گوتیـان: کێیە؟ جوبرائیـل گوتی: منم جوبرائیـل. پرسـیاریان کـرد کێـت لەگەڵە؟ جوبرائیـل گـوتی: مـوحەممەدم لەگەڵە. پرسییان ئایا ڕەوانە کراوە بۆ لای گەلەکەی؟ جوبرائیل گـوتی: بەڵـێ. ئینجـا گوتیـان ئەک بەخێـربێن و فەرمـوون وەرنە ژوورەوە. کاتێـک چووینە ژوورەوە حەزرەتـی هاروونمـان دیت. جوبرائیل گوتی: ئەوە حەزرەتی هاروونە سەلامی لێ بکە. ئینجا منیش سەلامم لێ کرد. ئەویش وڵامـی دایەوە و گـوتی: سـڵاو لە پێغەمـبەری سـاڵح و بـرای سـاڵحم. پاشـان بەرزکـراینەوە بـۆ ئاسمانی شەشـەم، لە دەرگامن دا و وەڵامیـان دایەوە پرسـیاریان کرد: کێیە؟ جوبرائیل گوتی: منم جوبرائیل. پرسـیاریان کـرد کێت لەگەڵە؟ جوبرائیل گوتی: موحەممەدم لەگەڵە. پرسیاریان کرد ئایا ڕەوانە کـراوە بـۆ لای گەلەکەی؟ جوبرائیـل گـوتی: بەڵـێ. ئینجـا گوتیـان ئەک بەخێـربێن و فەرمـوون وەرنە ژوورەوە. کاتێـک چووینە ژوورەوە حەزرەتـی مووسـامان دیت. جوبرائیـل گـوتی: ئەوە حەزرەتی مووسایە، سەلامی لێ بکە. ئینجا منیش سـەلامم لـێ کـرد. ئەویـش وڵامـی دایەوە و گـوتی: سـڵاو لە پێغەمـبەری ساڵح و برای ساڵحم، کاتێک ویستمان بڕۆین حەزرەتی مووسـا دەسـتی کـرد بە گریـان. پرسـییان بۆچـی دەگرییـت ئەی مووسـا؟ مووسا گوتی: لەبەر ئەوە دەگریم گەنجێک لە دوای مـن بـووە بە پێغەمـــبەر کە ئـــومەتەکەی ئەو زیـــاتر دەچـــنە بەهەشـــت لە ئومەتەکەی مـن. پاشـان بەرزکراینەوە بـۆ ئاسـمانی حەوتەم. لە دەرگامن دا و وەڵامیان دایەوە پرسـیاریان کـرد: کێیە؟ جوبرائیل گـوتی: مـنم جوبرائیـل. پرسـیاریان کـرد: کێـت لەگەڵە؟ جوبرائیـل گوتی: موحەممەدم لەگەڵە. پرسیاریان کرد ئایـا ڕەوانە کـراوە بـۆ

لای گەلەکەی؟ جوبرائیل گوتی: بەڵێ. ئینجا گوتیان ئەک بەخێربێن فەرموون وەرنە ژوورەوە. کاتێک چووینە ژوورەوە حەزرەتی ئیبراهیممان دیت. ئینجا جوبرائیل گوتی ئەوە ئیبراهیمی باوکتە سەلامی لێ بکە. ئینجا منیش سەلام لێ کرد. حەزرەتی ئادەم جوابی سەلامەکەی دامەوە و فەرمووی: سڵاو لە پێغەمبەری سالح و کوڕی سالحم. پاشان بەرزکرامەوە بۆ (سدرة المنتهى) کە بەری درەختەکانی وەکوو (قلالی هەجەر) وابوو. گەڵاکانیشی وەکوو گوێی فیل بوو. ئینجا جوبرائیل گوتی: ئەوە (سدرة المنتهى)یە، ئینجا چوار ڕووبارمان دیت. دوو دانەیان دیار و دوو دانەکەی دیکە نادیار و شاراوە بوون. لە جوبرائیلم پرسیی: ئەو ڕووبارانە چین؟ جوبرائیل گوتی: ئەو دوو ڕووبارانەی شاراوەن ئەوانە رووباری بەهەشتن. ئەوانەشی کە دیارن ئەوە نیل و فووراتن. پاشان (بیت المعمور)م پیشان درا. گوتم: ئەی جوبرائیل ئەوە چییە؟ جوبرائیل گوتی: ئەوە (بیت المعموره) کە جێگای خواپەرستیی فریشتەکانە. هەموو رۆژێک حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناوی و ئەو حەفتا هەزارە جارێکی دیکە ناگەڕێنەوە و بەردەوام پۆل پۆل فریشتەی تازە دێنە ناوی تا ڕۆژی دوایی. پاشان قاپێک لە شەراب و قاپێک شیر و قاپێک هەنگوینیان بۆ هێنام. من قاپە شیرەکەم هەڵبژارد. ئینجا جوبرائیل گوتی: ئەی موحەممەد! تۆ فیترەتت هەڵبژارد بۆ خۆت و گەلەکەت. پاشان بۆ هەر شەو و ڕۆژێک پەنجا نوێژ لەسەر خۆم و ئومەتەکەم فەرز کرا. لە کاتی گەڕانەوەمدا مووسام دیت. مووسا لێی پرسیم: ئەی موحەممەد! خوا ئەمری چی پێ کردی؟ گوتم: خوا پەنجا نوێژی لەسەر خۆم و گەلەکەم فەرز کرد. ئینجا مووسا گوتی: گەلەکەت توانای

ئەوەی نییە لە شەو ڕۆژێکدا پەنجا نوێژ بکا، چونکە من پێش تۆ خەڵکم تاقی کردۆتەوە و باشتر دەزانم. بگەڕێوە لای پەروەردگار و داوای لێ بکە بۆت کەم بکاتەوە. ئینجا گەڕامەوە لای پەروەردگار و داوام کرد بۆم کەم بکاتەوە. ئەویش دە نوێژی لەسەر لابردم. لە کاتی گەڕانەوەمدا مووسا دوبارە گوتی: هێشتان زۆرە! گەڕامەوە لای پەروەردگار داوام کرد بۆم کەم بکاتەوە. ئەویش دە نوێژی دیکەی لەسەر لابردم. لە کاتی گەڕانەوەدا مووسا گوتی: هێشتان زۆرە داوا بکە بۆت کەم بکاتەوە. ئینجا گەڕامەوە لای پەروەردگار داوام کرد کە بۆم کەم بکاتەوە. ئەویش دە نوێژی دیکەی لەسەر لابردم. کاتێک گەڕامەوە مووسا دوبارە گوتی: زۆرە و گەلەکەت توانای ئەو هەموو نوێژەی نییە. دووبارە گەڕامەوە لای پەروەردگار و داوام لێ کرد بۆم کەم بکاتەوە. ئەویش دە نوێژی دیکەی بۆ لابردم. کاتێک گەڕامەوە، مووسا گوتی: هێشتان زۆرە و بڕۆ داوا بکە خوا بۆت کەم بکاتەوە. ئینجا گەڕامەوە لای پەروەردگار و داوام کرد کە بۆم کەم بکاتەوە. ئەویش بۆی کردم بە پێنج نوێژ لە شەووڕۆژێکدا. کاتێک گەڕامەوە دووبارە مووسا گوتی: هێشتا زۆرە و گەلەکەت ناتوانێ لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژ ئەنجام بدا. بڕۆ بگەڕێوە لای پەروەردگار و داوا بکە لەسەرت سووک بکا. ئینجا گوتم: ئەی مووسا بەڕاستی ئەوەندە داوام لە خوا کرد شەرم دەکەم لەوە زیاتر داوای لێ بکەم. ڕازی دەبم و ملکەچی فەرمانی خوا دەبم. ئینجا خوای گەورە فەرمووی: نوێژم لەسەر بەندەکانم فەڕز کرد و لەسەریشم سووک کردن)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

## سێ درۆیەکەی حەزرەتی ئیبڕاهیم (علیه السلام).

لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرمووویەتی:((حەزرەتی ئیبراهیم هەرگیز هیچ درۆیەکی نەکردووە جگە لەو سێ درۆیە. دوو دانەیان بەینی خۆی و خوا بوو کاتێک گوتی: **(إني سقيم)** الصافات/٨٩. ئەوەش کە گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾ الصافات: ٨٩

ئەوەی سێیەمیش دەربارەی سارای خێزانی بوو. ئەو کاتەی کە لەگەڵ سارای خێزانی کە ئافرەتێکی جوان و بەرچاو بوو ڕۆیشتن بۆ ئەو زەوییەی پاشایەکی زاڵم و ستەمکاری لێ بوو. لەو کاتەدا حەزرەتی ئیبراهیم بە سارای گوت: ئەگەر ئەو پاشا ستەمکارە بزانێ تۆ خیزانمی، ئەوە یەکسەر بە زۆری زۆردار تۆ بۆ خۆی دەبات. بۆیە کاتێک پرسیاری لێ کردی بڵێ ئەو پیاوە (ئیبراهیم) برامە. لە ئیسلامیشدا تۆ خوشکمی، چونکە لەو زەوییەدا لە من و تۆ زیاتر موسوڵمانی تێدا نییە. کاتێکیش چوونە ناو ئەو شارە، دار و دەستەی ئەو پاشایە سارایان دیت و زۆر پێی سەرسام بوون! بۆیە یەکسەر ڕۆیشتن و بە پاشایان ڕاگەیاند کە ئافرەتێک هاتۆتە ناو شار ئەوەندە جوانە بە هیچ شێوەیەک نابێ لە کیس خۆتی بدەی! ئینجا پاشا چەند کەسێکی نارد کە بڕۆن سارای بۆ بێنن. ئەوانیش سارایان بۆ برد. ئیبراهیمیش دەستی کرد بە نوێژ و پاڕانەوە بۆ ئەوەی خودا

سـارا بپـارێزێ لەدەسـتی ئەو پاشـا سـتەمکارە. ئەو پاشـایە هەروەکوو پیشەی خۆی ویستی دەستدرێژی بکاتە سەر سارا. بەڵام کاتێک ویستی لێی نزیک بێتەوە، بە فەرمانی خوا هەردوو دەستی رەق بوون و نەیتوانی دەستی لێ بدا. پاشا سەری سوڕما، داوای لە سارا کرد کە دوعا بکا دەستی چاک بێتەوە، بەو مەرجەی ئەویش دەستی لی نزیک نەکاتەوە. ئینجا سارا دوعای کرد و پاشا دەستی چاک بوویەوە. کاتێک چاک بوویەوە دووبارە ویستی دەستی لێ نزیک بکاتەوە. خوای گەورەش دووبارە دەستی ڕەق کردەوە خراپتر لە جاری یەکەم. بۆیە نەیتوانی دەستی بجوڵێنێ و لێی نزیک ببێتەوە. ئینجا پاشا داوای لێ کردەوە کە دوعا بکات و دەستی چاک بێتەوە بەو مەرجەی ئەویش دەستی لێ نزیک نەکاتەوە. سارا دوعای کرد و پاشا چاک بوویەوە. دیسان نیەتی خراپ بوو و ویستی دەستدرێژی بکاتە سەر، ئەمجارەیان زۆر خراپتر لە دوو جارەکەی پێشوو دەستی رەق بوو، ئینجا داوای لە سارا کرد کە دوعا بکات چاک بێتەوە، بەو مەرجەی ئەویش دەستی لێ نزیک نەکاتەوە. دواتر کە چاک بوویەوە یەکسەر بانگی ئەو خزمەتکارەی کرد کە سارای بۆ هێنابوو، بە خزمەتکارەکەی گوت: تۆ شەیتانت بۆ من هێناوە خۆ ئەوە بەشەر نییە. بڕۆ لایبە لەبەر چاوم و دەریان بکە لە زەویی من و بۆ خۆشت لەگەڵی بڕۆ و بە سەلامەتی بیگەیەنەوە لای براکەی. ئینجا سارا ئەو شوێنەی بەجێ هێشت و کاتێک گەیشتەوە لای ئیبراهیم، ئیبراهیم ڕووی وەرگێڕا. ئینجا لە سارای پرسیی: چی ڕوویدا؟ ساراش گوتی: سوپاس بۆ خوا. خـوا پاراسـتمی لەدەسـتی ئەو سـتەمکارە و خزمەتکارێکیشـی لەگەڵ نـاردم کە هەتـا ئێـرە لەگەڵـم هـات و پاسـەوانم بـوو.

ئەبوهــورەیرە دەفەرمــووێ: ئەوە دایکتــانە ئەی نەوەی ئــادەم. ئەوەش مەبەستی لە پاکی و رەوشتبەرزی سارایە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

## سیویەک

**حەزرەتی یەحیا و ئەو پێنج شتەی کە خوا فەرمانی پێ کرد ئەنجامیان بدا.**

لە حارثی ئەشعەرییەوە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێ کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: (( خوا فەرمانی بە یەحیای کوڕی زەکەریا کرد بە ئەنجامدانی پێنج شت، فەرمانیشی بە نەوەی ئیسرائیل بکا ئەوانیش ئەو پێنج شتە ئەنجام بدەن. دواتر عیسای کوڕی مەریەم بە یەحیای گوت: خوا فەرمانی پێ کردووی کە ئەو پێنج شتە بکەی و بە نەوەی ئیسرایلیشی ڕابگەیەنی کە ئەو پێنج شتە بکەن، جا ئێستا تۆ پێیان ڕاددەگەیەنی یان من پێیان ڕابگەیەنم؟ یەحیا گوتی: دەترسم ئەگەر تۆ پێش من پێیان ڕابگەیەنی ئەوە خوا سزام بدا یانیش ڕۆبچم بە زەویدا. ئینجا یەحیا هەموو خەڵکی لە (بیت المقدس) کۆ کردەوە تا پڕ بوو. خەڵکی بە ڕیز و بێدەنگیەوە دانیشتن. دواتر حەزرەتی یەحیا گوتی: ئەی خەڵکینە! خوا فەرمانی پێکردووم بەوەی پێنج شت بکەم و و بە ئێوەشی ڕابگەیەنم کە ئەو پێنج شتە بکەن. یەکەم شت کە فەرمانی پێ کردوون ئەوەیە: تەنیا خوا بپەرستن و هیچ شەریک و هاوتایەکی بۆ بڕیار نەدەن. نموونەی کەسێک کە شەریک بۆ خوا بڕیار دەدا وەکوو نمونەی پیاوێکە، کە کۆیلەیەک بە پارە یان زێڕی خۆی بکڕێت و پێی بڵێت: ئەوە ماڵەکەمە و ئەوەش کارەکەمە. کارم بۆ بکە و قازانجەکەم بۆ بێنەوە. ئەو کۆیلەیەش بچێت کار بۆ کەسێکی دیکە بکات و قازانجەکەشی هەر بۆ ئەو

ببات. کێتان پێی خۆشە کۆیلەکەتان ئاوا بێ؟ خواش ئێوەی درووست کردووە و ڕسق و ڕۆزیتان دەدات. بۆیە شەریک و هاوەڵی بۆ پەیدا مەکەن. دووەمیان: خوا فەرمانی پێ کردوون کە نوێژ بکەن و لە نوێژدا ئاوڕ نەدەنەوە. سێیەمیان: فەرمانی پێ کردوون کە ڕۆژوو بگرن. نموونەی ئەو کەسەش کە ڕۆژوو دەگرێ وەکوو کەسێک وایە شووشەیەک میسکی پێ بێ و کۆمەڵێک کەسیشی لەگەڵ بن، کە هەموویان حەزیان لێ بێ بۆنی ئەو شووشە میسکە بکەن. بۆنی دەمی ڕۆژووەوانیش زۆر لە بۆنی میسک خۆشترە لە لای خوا. چوارەم: فەرمانی پێ کردوون کە چاکە بکەن و لە پێناو خوادا ببەخشن. نموونەی ئەو کەسەش کە چاکە دەکات وەکوو ئەو کەسەیە، کە دوژمن دەسگیری بکات و دەستەکانی لە ملی ببەستێ. ئەویش پێیان بڵێ: ئایا بە چ شتێک لێم خۆش دەبن و ئازادم دەکەن؟ چ شتێکتان بدەمێ؟ ئینجا بە ڕاست و بە چەپدا ئەوەی هەیەتی و نیەتی دەیانداتێ بۆ ئەوەی ئازادی بکەن و ڕزگاری ببێ. پێنجەمیان فەرمانی پێ کردوون: زۆر یاد و زکری خوا بکەن. نموونەی ئەو کەسەش کە زۆر یادی خوا دەکا وەکوو ئەو کەسە وایە، کە دوژمن زۆر بەدوایدا دەگەڕێ و دەیەوێ بەزووترین کات دەسگیری کات. ئەویش ڕاددەکات و دەچێتە ناو قەڵایەک لەوێدا خۆی حەشار دەدات و خۆی دەپارێزی لەدەست دوژمن، بەندەی ئیمانداریش بەهەمان شێوە بە یاد و زکری خوا نەبێ شەیتان لەکۆڵی نابێتەوە)).

موحەمەدیش سەلامی خوای لێ بێ فەرمووی: ((منیش پێنج شتتان پێ دەڵێم کە خوا فەرمانی پێ کردووم پێتانی بڵێم: لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵمانان بن و دامەبڕێن، گوێڕایەڵ بن و

فەرمانەکانی خوا جێبەجێ بکەن، هیجرەت و جیهاد بکەن لە پێناوی خوادا، ئەوەشی بستێک لە کۆمەڵی موسوڵمانان دوورکەوێتەوە و خۆی دوورەپەرێز بگرێ، ئەوە ئیسلام لە سەری دەچێتە دەر هەتا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە ناو کۆمەڵی موسوڵمانان، هەر کەسێکیش بانگەوازی جاهیلیەت بکات ئەوە لەناو دۆزەخدا بەسەر ئەژنۆدا دەکەوێ)).

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر کابرا نوێژیش بکا و ڕۆژووش بگرێ؟ پێغەمبەر فەرمووی: ((بەڵێ ئەگەر نوێژیش بکا و ڕۆژووش بگرێ، ئێوە دەبێ بانگەواز بۆ پەیامی خوا بکەن، ئەو خوایەی کە ناوی موسوڵمان و ئیماندار و بەندەی خوای لێناون)).

هذا حديث صحيح اخرجه الترمذى والنسائى ببعضه واحمد وابن حبان والحاكم وصححه و وافقه الذهبى

و قال الترمذى: (( حسن صحيح ))

## سیودوو

## حەزرەتی مووسا و حەزرەتی خزر سەلامی خوایان لێ بێ.

له ئوبەی کوڕی کەعبەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ((له سەردەمی حەزرەتی مووسادا سەلامی خوای لێ بێ له کاتێکدا که مووسا قسەی بۆ گەلەکەی دەکرد و نەسیحت و ئامۆژگاری دەکردن، پیاوێک هەستا سەر پێ و گوتی: ئەی مووسا کێ له هەموو کەس زاناترە لەم دنیایە؟ مووسا گوتی: من له هەموو کەس زاناترم. مووسا دەبوایە بڵێ خوا زاناترینە و زانستی خوا بێ کۆتایە، بەڵام وای نەگوت و خواش سەرزەنشتی کرد و وەحی بۆ نارد کە ئەی مووسا! بەندەیەکم هەیە لە ناوچەیەک لە بەیەکگەیشتنی دوو دەریاکە لە تۆ زیرەکترە. مووسا گوتی: ئەی پەروەردگار جا من چۆن دەستم پێی بگات؟ خوا پێی فەرموو: ماسییەک بخە ناو زەمبیلەیەکەوە، له هەر جێیەک ئەو ماسییەتان لێ ون بوو ئەو جێگایە شوێنی دەرکەوتنی ئەو بەندەیەمە و لەوێ دەیبینی. ئینجا مووسا ماسییەکەی خستە ناو زەمبیلەکەوە و گەنجێکیش کە ناوی ((یوشعی))ی کوڕی زەنوون بوو، لەگەڵ خۆیدا بردی. کاتێک گەیشتنە شوێنی بەیەکگەیشتنی دوو دەریاکە هەستیان بە هیلاکی و ماندووبوون کرد، بۆیە لە لای بەردێک لێی دانیشتن و دواتر خەویان لێ کەوت. لەوکاتەدا کە ئەوان نووستبوون، ماسییەکەش لە زەمبیلەکە هاتە دەرەوە و چووە ناو دەریاکە، ئینجا مووسا و هاوڕێکەی لە خەو هەستان و دەستیان کردەوە بە ڕۆیشتن و شەو و ڕۆژێک بە ڕێگەوە

بـوون. ئەو شـەوە کە بەیانییـان کـردەوە، مووسـا بە هـاوڕێکەی گوت:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ ﴾ الكهف: ٦٢

واتە: ئـادەی خواردنەکەمـان بهێـنە چـونکە بەڕاسـتی لەو سـەفەرەماندا زۆر هـیلاک و مانـدوو بـووین. مووسـا هەتـا لەو جێگایە تێنەپەڕی کە خوا فەرمانی پێ کردبوون ئەوەندە هەستی بە ماندووبوون نەکرد، ئینجا هاوڕێکەی گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ ﴾ الكهف: ٦٣

واتە: ئەگەر بیـرت بێـت ئەو کـاتەی لە لای بەردەکە پـاڵکەوتین لەوێ ماسییەکە هاتۆتەدەر و منیش لەبیرم چوو پێت بڵێم. ئینجا مووسا ئەوەی زۆر پێ خۆش بوو و گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الكهف: ٦٤

واتە: ئەوە بـوو کە ئـێمە دەمانەویسـت. ئینجـا گەڕانەوە ئەو شوێنەی کە پشوویان لێ وەرگرتبوو، ڕێـک لای بەردەکە. کاتێک گەیشـتنە لای بەردەکە ئەو بەنـدەیەی خوایـان دیـت و مووسـا سـەلامی لـێ کـرد. خـزر گـوتی: ئەوە لێرەش سـەلام هەیە؟ پێـی سـەیر بـوو و پێـی وا نەبـوو کە خەڵکی ئەوێ موسـوڵمان بن و سـەلامی موسـوڵمانانەیان هەبـێ. مووسـا گـوتی: مـن مووسـام.

ئەویش گوتی: مووسای پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل؟ گوتی: بەڵێ. ئینجا مووسا گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ ﴾ الكهف: ٦٦

واتە: مۆڵەتم دەدەی کە لەگەڵت بم بۆ ئەوەی ئەو زانستەی خوا فێری کردووی تۆش فێری منی بکەی؟

خزر گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ ﴾ الكهف: ٦٧

واتە: بەڕاستی تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆڕاگر بیت، چونکە خوا شتانێکی فێری من کردووە کە تۆ نایزانی و لە نهێنییەکەشی تێناگەی. هەندێ شتیشی فێری تۆ کردووە کە من نایزانم و لە نهێنییەکەی تێناگەم. ئینجا مووسا گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِي لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ ﴾ الكهف: ٦٩

واتە: دەمبینیت ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت خۆڕاگر دەبم و لە هیچ فەرمانێکت دەرناچم.

دواتر خزر ڕازی بوو، بەو مەرجەی کە مووسا خۆ لە ئیشەکانی وەرنەدا. ئینجا لەگەڵ مووسا بە کەنار دەریادا ڕۆیشتن هەتا ئەوکاتەی کەشتییەک بە لایاندا تێپەڕی، ئینجا داوایان لە خاوەنانی کەشتییەکە کرد کە سواریان کەن لەگەڵ خۆیان، ئەوانیش چونکە خزریان دەناسی بەبێ کرێ و پارە

سواریان کردن. کاتێک لەنێو کەشتییەکە بوون چۆلەکەیەک هات و لەسەر لایەکی کەشتیەکە نیشتەوە. دواتر چوو دندووکێک یان دوو دندووکی لە ئاوەکە دا و ئاوی خواردەوە. خزر بە مووسای گوت: ئەی مووسا بە دندووک لێدانی ئەو چۆلەکە ئاوی ئەو بەحرە چەندە کەمی کرد، زانستی من و تۆش هەر ئەوەندە لە زانستی خوا کەم دەکات. ئینجا خزر کونێکی بچووکی لە کەشتییەکە کرد، کە لە تەختە دروست کرابوو. مووسا زۆری پێ ناخۆش بوو. لە بیریشی نەمابوو کە نابێ پرسیار بکات. ئینجا بە خزری گوت: ئەوانە بەبێ کرێ سواریان کردین، تۆش بە ئەنقسەت کەشتییەکەت.کون کرد بۆ ئەوەی نقووم بن؟ خزر گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ:﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الكهف: ٧٢

واتە: ئەی پێم نەگوتی کە تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆڕاگر بیت؟!

مووسا گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ:﴿ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ ﴾ الكهف: ٧٣

واتە: یەکەم جارم بوو و بەڵێنەکەم لەبیرچووبوویەوە، بۆیە لێم مەگرە. دواتر وەڕێکەوتن هەتا لە ڕێگەدا کوڕێژگەیەکی مێردمنداڵیان دیت، کە لەگەڵ کۆمەڵێک منداڵدا یاریی دەکرد. ئینجا خزر منداڵەکەی لە منداڵەکانی دیکە جیا کردەوە تا لە

جێگایەک گرتی و سەری لە لاشەی جیا کردەوە. مووسا خەریک بوو لە خەفەتان دڵی بتەقێ، خۆی پێ نەگیرا و گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الكهف: ٧٤

واتە: ئـەوە بـۆچی کەسـێکی بێگوناهـت کوشـت، بـێ ئـەوەی تاوانێکی وای کردبێت و شایستەی کوشتن بێت؟ سوێند بـە خوا بە ڕاستی کارێکی ناپەسەند و ناڕەوات ئەنجام دا. ئینجا خـزر بە مووسای گوت:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ ۞ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ ﴾ الكهف: ٧٥

واتە: پـێم نـەگوتی کـە تـۆ هـەرگیز ناتوانیت لەگـەڵ منـدا ئـارام بگریت و دان بە خۆتدا بگریت؟. ئینجا مووسـا پەشـیمان بـووەوە و گـوتی: باشـە ئەم جـارە ئەگەر پرسـیارم کـرد چیـدیکە هـاوڕێیەتیم مەکە، چـونکە تەواو بیـانووم نـامێنێ و مـافی خـۆتە چیتر لێم قبووڵ نەکەی.

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهْلَ قَرْيَةٍ ٱسْتَطْعَمَآ أَهْلَهَا فَأَبَوْا۟ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ ۖ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ ﴾ الكهف: ٧٧

واتە: پاشـان دەرچـوون و ڕۆیشـتن هـەتا گەیشـتنە نـاو خـەڵکی شارۆچکەیەک برسییان بوو، داوای خۆراکیان لـە خەڵکەکە کـرد، کـەچی دەسـتیان نـا بـە ڕوویانـەوە و میوانداریـیان لـێ نـەکردن. ئەوسـا لـەناو شـارەکەدا دیوارێکیـان بـەدی کـرد خـەریک بـوو

دەڕووخا، بەڵام خزر هەڵیچنیەوە و چاکی کردەوە و بەرزی کردەوە، مووسا وتی: ئەگەر بتویستایە، کرێیەکت بەرامبەر ئەم کارە وەردەگرت، دەماندا بە خۆراک و پێی تێر دەبووین. کاتێک خزر بۆی دەرکەوت کە مووسا ناتوانێ دان بە خۆیدا بگرێ، پێی گوت:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ۝٧٨ ﴾ الكهف: ٧٨

واتە: ئیتر لێرە بەدواوە کاتی جیابوونەوەی نێوان من و تۆیە. من کەمێکی تر زانیاریت پێ دەدەم لە حەقیقەت و سەرئەنجامی ئەو شتانەی، کە نەتتوانی ئارام بگریت لە بەرامبەریان. ئینجا خزر گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِي ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ۝٧٩ ﴾ الكهف: ٧٩

واتە: ئەو کەشتییەی عەیبدارم کرد چەند هەژارێک خاوەنی بوون لە دەریادا کاریان دەکرد، جا منیش ویستم عەیبداری بکەم، چونکە لەو ناوەدا پاشایەک هەبوو، هەموو کەشتییەکی چاک و ڕێکوپێکی داگیر دەکرد.

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۝٨٠ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ۝٨١ ﴾ الكهف: ٨٠ - ٨١

واتـه: منداڵەکـەش کـه کوشـتم دایـک و بـاوکێکی ئیمانـداری هــەبوو، ترســاین لــەوەی کــه بەسەرکەشــی و بــێ دینــی و خوانەناسی هیلاک و ماندوویان بکات، چونکه هەر لە ئێستاوه سەرکەشـی و لاسـاریی پێـوه دیـار بـوو. بـۆیه بـەو کارەمـان ویستمان که پەروەردگاریان لەجیاتی ئەو پاکتر و چاکتریان پێ ببەخشـێت و بــه منــداڵێکی خــاوەن بــەزەیی و میهرابــانتر بەهرەوەریان بکات و منداڵەکەش بەهەشتی بێت.

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ مَا لَمۡ تَسۡطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا ٨٢ ﴾ الكهف: ٨٢

واته: دیوارەکـەش کـه چـاکم کـردەوه، خاوەنەکـەی دوو منداڵی هــەتیوی شــارۆچکەکه بــوون، لــه ژێریــدا گەنجینەیــەکی زێــڕ و زیویان هەبوو که باوکیان بۆی شاردبوونەوه. ئەگەر گوێمان پێ نەدایه، باران و لافاو دەری دەخست و ئەو خەڵکه ڕەزیلـەی کـه میوانـدارییان لـێ نـەکردین، دەسـتیان دەکـەوت. بـاوکی ئەو دوو منداڵـەش خوانـاس و پیاوچـاک بـوو، جـا پـەروەردگارت ویسـتی کاتێـک گەنجینەکـەیان دەسـت بکـەوێت کـه گـەوره و بـەهێز بـن ئەوسا دەری بهێنن. ئەمەش وەکوو ڕەحمـەتێکی تایبـەتی لەلایـەن پەروەردگارتەوه لەبەر خاتری باوکیان، دڵنیاشبه که هـەموو ئـەو کارانـەم لهخـۆوه نـەکردووه، ئیتـر ئـەوه بـوو ڕاز و نهێنیـی ئـەو شتانەی که خۆت بۆ نەدەگیرا کاتێک ئەنجامم دەدان)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

## سیوسێ

## ئەو پیاوەی کە خوا بە زەویدا بردیە خوار.

لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێرنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی : ((پیاوێک لە گەلانی پێش ئێوە بە ڕێگەدا ڕێی دەکرد، زۆر بە خۆی و جلوبەرگی سەرسام بوو و بەفیز و خۆبەزلزانییەوە سەیری دەوروبەری دەکرد. لەپڕ خوای گەورە غەزەبی لێ گرت و بە زەویدا بردیە خوار، وەکوو سزایەکیش ئەو پیاوە هەتا قیامەت بە زەویدا دەچێتە خوارەوە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

## سیوچوار

### چەن دیمەنێک لە خۆڕاگریی بڕوادارانی پێش ئێمە.

لە خەبابی کوڕی ئەرەتەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرمووویەتی: ((لە سەردەمانی پێش ئێوە، ئیمانداریان هێناوە تەنیا لەبەر ئەوەی ئیماندارە زەوییان بۆ هەڵکەندووە و نیوەی لاشەیان خستۆتە ناوی و بە دوو کەس بە مشار لە سەریەوە دوولەتیان کردووە، هەرواش لە دینەکەی پەشیمان نەبۆتەوە. هی وا هەبووە بە شانەی ئاسن پێستیان لە لەشی داماڵیوە و هێشتا لە دینەکەی پەشیمان نەبۆتەوە. سوێن بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، خوا ئەو دینە سەردەخات. تا وای لێ دێ سوار لە ((سنعا))وە دەچێ بۆ ((حضرموت))، کە جگە لە خوا و پاشان لە گورگ کە مەڕەکەی بخوا لە هیچی دیکە ناترسێ، بەڵام ئێوە زۆر پەلە دەکەن)).

هذا حدیث صحیح اخرجە بخاری و ابو داود و النسائی و غیرهم .

## کۆتا کەس کە دەچێتە بەهەشت.

لە ئیبن مەسعوودەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((کۆتا کەس کە دەچێتە بەهەشت پیاوێکە کە بە زەحمەت لە دۆزەخ ڕزگاری دەبێ و پێستی بەتەواوی سووتاوە. تاوتاو دەکەوێت و هەڵدەستێتەوە تا لە دۆزەخ دێتە دەر، کاتێک ڕزگاری بوو دەڵێ: سوپاس بۆ ئەو خوایەی لە دۆزەخ ڕزگاری کردم، بەڕاستی خوا چاکەیەکی لەگەڵ کردم، کە نە لە پێش من لەگەڵ کەسی کردووە و نە لە دوای منیش لەگەڵ کەسی دەکات. پاشان خوا لە دەرەوەی بەهەشت درەختێکی پێشان دەدات کە کانییەک بە ژێریدا دەڕوا، کابرا ئەوەندە تینووی سەوزایی و دار و درەختە، لەتاوا یەکسەر دەڵێ: ئەی پەروەردگار بمگەیەنە ئەو درەختە بۆ ئەوەی لە ژێر سێبەرەکەی بحەسێمەوە و ئاو لە کانییەکە بخۆمەوە. ئینجا خوا پێی دەفەرمووێ: ئەی نەوەی ئادەم دەترسم ئەگەر ئەوەت بۆ بکەم، داوای شتی دیکەم لێ بکەی. کابرا دەڵێت: نا ئەی پەروەردگار! بەڵێن بێ داوای هیچی دیکە ناکەم. خواش لێی ناگرێ چونکە دەزانێ شتی وەها دەبینێ، کە ئۆقرەی نامێنێ و ناتوانێ داوای نەکات. پاشان خوا دەیگەیەنێتە ئەو درەختە، کابرا لە ژێری دەحەسێتەوە و ئاو لە کانییەکە دەخواتەوە. پاشان خوا درەختێکی سەوزتر و کانییەکی جوانتری پێشان دەدات، کابرا کە درەختەکە دەبینێ، یەکسەر دەڵێ: ئەی پەروەردگار! بمگەیەنە ئەو درەخت و کانییە بۆ ئەوەی لە ژێر درەختەکەی بحەسێمەوە

و ئاو له كانييەكە بخۆمەوە. بەڵێنیش بێ لەوە زیاتر داوای هیچی دیكەت لێ ناكەم. ئینجا خوا پێی دەفەرمووێ ئەی نەوەی ئادەم ئەی بەڵێنت پێ نەدام كە داوای هیچی دیكەم لێ نەكەی؟ دەترسم ئەگەر ئەوەت بۆ بكەم، داوای شتی دیكەم لێ بكەی. كابرا دەڵێت: نا ئەی پەروەردگار! بەڵێن بێ داوای هیچی دیكە ناكەم. خواش لێی ناگرێ، چونكە دەزانێ شتی وەها دەبینێ كە سەبری نامێنێ و ناتوانێ داوای نەكات. ئینجا خوا كابرا دەگەیەنێتە ئەو درەختە. كابرا لە ژێری دەحەسێتەوە و ئاو لە كانییەكە دەخواتەوە. پاشان خوا درەخت و كانییەكی لەبەردەم دەرگای بەهەشت كە لە درەخت و كانییەكانی پێشتر سەوزتر و پاراوترن پێشان دەدات. كابرا كە درەختەكە دەبینێ یەكسەر دەڵێت: ئەی پەروەردگار! بمگەیەنە ئەو درەخت و كانییە بۆ ئەوەی لە ژێر درەختەكە بحەسێمەوە و ئاو لە كانییەكە بخۆمەوە، بەڵێنیش بێ لەوە زیاتر داوای هیچی دیكەت لێ ناكەم. ئینجا خوا پێی دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم ئەی بەڵێنت پێ نەدام كە داوای هیچی دیكەم لێ نەكەی؟ دەترسم ئەگەر ئەوەت بۆ بكەم داوای شتی دیكەم لێ بكەی. كابرا دەڵێ: نا ئەی پەروەردگار! بەڵێن بێ داوای هیچی دیكە ناكەم. خواش لێی ناگرێ چونكە دەزانێ شتی وەها دەبینێ كە سەبری نامێنێ و ناتوانێ داوای نەكات. كاتێك خوا دەیگەیەنێتە لای ئەو درەختە گوێی لە دەنگەدەنگی خەڵكی ناو بەهەشت دەبێ، كابرا سەبری نامێنێ و یەكسەر دەڵێت: ئەی پەروەردگار! بمخەرە ناو بەهەشت، خواش پێی دەفەرموێ: ئەی بەندەكەم بەڕاستی داواكاریەكانت تەواو نابن و هەر داوای شتی زیاتر دەكەی، ئێستا ڕازی بەوەی بە ئەندازەی دوو هێندەی دنیات پێ بدەم؟

کابرا واقی وڕ دەمێنێ و دەڵێت: ئەی پەروەردگار! ئەوە گاڵتەم پێ دەکەی لە کاتێکدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ لەوکاتەدا پەروەردگار پێدەکەنێ. ئیبن مەسعوودیش کە گێڕەرەوەی فەرموودەکەیە، لەکاتی گێڕانەوەی فەرموودەکە دەستی کرد بە پێکەنین. بە هاوەڵانی گوت: دەزانن بە چی پێ دەکەنم؟ گوتیان: بە چی پێ دەکەنی ئەی ئیبن مەسعوود؟ ئیبن مەسعوود گوتی: بۆیە پێ دەکەنم چونکە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ کاتێک ئەو فەرمایشتەی بۆ باس دەکردین بەو شێوەیە پێکەنی و هاوەڵانیش لێیان پرسیی: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی پێ دەکەنی؟ پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرمووی: بەوە پێدەکەنم کە خوا بەو بەندەیە پێدەکەنێ کاتێک بە خوا دەڵێ: ئەوە گاڵتەم پێ دەکەی لە کاتێکدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ ئینجا خوای گەورە پێدەکەنێ و پێی دەفەرمووێ: نەخێر گاڵتەت پێ ناکەم ئەی بەندەکەم بەڵکوو من توانام بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو چیم بوێ دەیکەم)).

هذا حديث صحيح اخرجه مسلم و احمد

## بەرزترین و نزمترین پلەی بەهەشت.

لە موغەیرەی کوری شوعبەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ((حەزرەتی مووسا لە پەروەردگاری پرسیی: کێ لە بەهەشت کەمترین بەشی بۆ هەیە؟ لە ڕێگەی وەحییەوە پێی گوترا: ئەی مووسا کاتێک خەڵکی هەموو چوونە بەهەشت، کۆتا کەس پیاوێک دەمێنێ، ئینجا خوا پێی دەفەرمووێ: ئەی بەندەکەم برۆ ناو بەهەشت، کابراش وا دەزانێ تەواو جێگا بۆ ئەو نەماوە و بەشی ئەو نەماوە. بۆیە دەڵێت: ئەی پەروەردگار! بچمە کوێ لە کاتێکدا خەڵکی هەمووی جێگە و بەشی خۆیان وەرگرتووە و جێگایەک بۆ من نەماوە؟ خوا پێی دەفەرمووێ: ڕازیی بەوەی هێندەی پادشایەکی دنیات پێ بدەم؟ کابرا دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار ڕازیم، ئینجا خوا پێی دەفەرمووێ: دە برۆ ئەوە دوو ئەوەندە و سێ ئەوەندە و چوار ئەوەندە و هەتا دەگاتە پێنج ئەوەندە، ئینجا کابرا دەڵێ ڕازیم ئەی پەروەردگار، پاشان پەروەردگار پێی دەفەرمووێ: برۆ ئەوە دە ئەوەندەی پادشایەکی دنیام پێ دای، ئەوەشی کە نەفس پێی خۆشە و چاو چێژی لێ دەبات بۆ تۆ هەیە لەناو ئەو بەهەشتەدا. ئینجا حەزرەتی مووسا دووبارە پرسیار لە پەروەردگاری دەکات و دەڵێ: ئەی کێ بەرزترین پلەی هەیە لە بەهەشت؟ پەروەردگار پێی دەفەرمووێ: ئەی مووسا، بە ڕاستی ئەوانە بەتایبەت ڕێزم لێ گرتوون و پلە و مەقامی تایبەتیان بۆ هەیە لە بەهەشت، ئەوانە شتانێکم بۆ داناون کە نە هیچ چاوێک

دیتـــوویەتی، نە هــیچ گـوێیەک بیســـتوویەتی، نە هــیچ دڵێکـیش هەستی پێ کردووە)).

پێغەمـبەر دەفەرمـووێ: ئەو ئـایەتەش سـەلمێنەری ئەوەیە کە خوا شتی تایبەتی بۆ بەندەکانی داناوە لە دوارۆژدا.

قَالَ تَعَالَى: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة: ١٧

واتە : مــرۆڤ نـــازانێ کە لە دوارۆژدا چ نـــازونیعمەتێکی بــۆ دانراوە.

هذا حدیث صحیح اخرجه مسلم و الترمذی و احمد

## سیوحەوت

### حەزرەتی ئەییوب و نەخۆشیەکەی.

لە ئەنەسی کوری مالیکەوە دەگێرنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((کاتێک حەزرەتی ئەییوب نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکەی هەژدە سالّی خایاند. دۆست و دوژمن لێی دوورکەوتنەوە تەنیا دوو کەس نەبێ کە دوو هاورێی زۆر خۆشەویست و تایبەتی بوون. هەموو بەیانییەک سەردانیان دەکرد و بە هەموو شێوەیەک لە خزمەتیدا بوون. رۆژێکیان یەکێک لەو دوو هاورێیە بەوەی دیکەی گوت: دەزانی دەبێ ئەییوب تاوانێکی زۆر گەورەی کردبێ کە بۆتە هۆی ئەوەی خوا ئاوای بەسەربێنێ؟ ئەوەی دیکە پرسیی: مەبەستت چییە لەو قسەیەی کردت؟ هاورێکەی وەلامی دایەوە و گوتی: ئێ باشە ئەگەر تاوانێکی گەورەی نەکردبێ، چۆن خوا هەژدە سالّ لەناو نەخۆشییەکدا دەیهێلّێتەوە و شیفای نادات؟! دواتر کاتێک ئەو دوو هاورێیە رۆیشتن بۆ لای ئەییوب، یەکێکیان خۆی بۆ نەگیرا و ئەوەی بۆ حەزرەتی ئەییوب باس کرد. حەزرەتی ئەییوب لە وەلامدا گوتی: وەلایی هیچ شتێک لە خۆمدا شک نابەم، تەنیا ئەوە نەبێ کە رۆژێکیان دوو کەسم دیتن کە دەمەتەقێیان بوو و لە هەمان کاتیشدا سوێندیان بە خوا دەخوارد لەسەر قسەکانیان. بۆیە کە هاتمەوە مالّێ، لە دلّی خۆمدا خۆم لێ بەری کردن و پێم ناخۆش بوو کە لە کاتی دەمەتەقێ و شەرەقسەدا ناوی خوا بێنن. پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ دەفەرمووێ: حەزرەتی ئەییوب ئەوەندە لاواز و

بێهێز بوو کە بۆ هەموو شوێنێک خێزانەکەی دەستی دەگرت و لەگەڵ خۆی دەیبرد. هەتا ڕۆژێکیان چوو بۆ ئیشی سەرئاو و درەنگ کەوت. خێزانەکەشی لە دەرەوە هەر چاوەڕێی بوو. لەو کاتەدا خوا بە حەزرەتی ئەیووبی فەرموو:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴿٤٢﴾ ﴾ ص: ٤٢

واتە : هەستە بە پێ برۆ و پێ لە زەوی بدە. بەو کانییە ساردە خۆت بشۆ و لەو کانییەش ئاو بخۆوە، ئەییوب پێیەکی لە زەوی دا، کانییەکی سارد هەڵقوڵا و بەو ئاوە ساردە خۆی شرد و جەستەی لە هەموو نەخۆشییەک خاوێن بۆوە. پاشان پێیەکەی دیکەی لە زەوی دا، کانییەکی دیکە هەڵقوڵا و لەو ئاوەشی خواردەوە. هەموو نەخۆشییەکانی ناوەوەی چارەسەر بوو. ئینجا ئەییوب لە هەموو نەخۆشییەکی ناوەوە و دەرەوە ڕزگاری بوو و ساخ و سەلامەت هاتە دەرەوە. کاتێک خێزانەکەی دیتی نەیناسییەوە بۆیە لێی پرسیی: ڕەحمەتی خوات لێ بێ، نازانی ئەو پێغەمبەرە نەخۆشە چیی لێ هات و بۆ کوێ چوو کە بۆ ئێرە هاتبوو بۆ سەرئاو؟ هەرچەندە کەس ئەوەندەی تۆ لە ئەییوب ناچێ ئەو کاتەی کە ساغ بوو، ئینجا حەزرەتی ئەییوب بە خێزانەکەی گوت: خۆمم ئەییوبم. ئینجا ئەییوب دوو تەلیسی هەبوو یەکێکیان گەنم و ئەوەی دیکە جۆ. خوا دوو هەوری بۆ ناردن. یەکێکیانی نارد بۆ سەر گەنمەکە و کردی بە زێڕ لە جیاتی گەنم، ئەوەی دیکەشی ناردە سەر جۆیەکە و کردی بە زیو لە جیاتی جۆ)).

هذا حديث صحيح ، اخرجه ابن حبان و ابو يعلى والبزار و غيرهم ، و صححه الحكم و وافقه الذهبى .

## سیوهەشت

### چەن دیمەنێک لە پەسڵان[4] و حەشر و حیساب.

ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ((کۆمەڵێک کەس هاتنە لای پێغەمبەری خوا و لێیان پرسیی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ئێمە لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگارمان دەبینین؟ پێغەمبەر وەڵامی دانەوە و فەرمووی: ئایا کەس دەتوانێ ڕێی ئەوەتان لێ بگرێ کە لە نیوەڕۆی ڕۆژێکی ساماڵ و هەتاودا خۆر ببینن؟ گوتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەر فەرمووی: ئەی کەس دەتوانێ ڕێی ئەوەتان لێ بگرێ کە لە کاتێکدا هیچ هەورێک بە ئاسمانەوە نییە و مانگ لە هەموو کاتێک جوانتر دیارە مانگ ببینن؟ گوتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەر فەرمووی: دەی وەک چۆن کەس ناتوانێ ڕێی ئەوەتان لێ بگرێ ئەوانە ببینن، ئاواش کەس ناتوانێ ڕێی ئەوەتان لێ بگرێ کە خوا ببین. ئینجا پێغەمبەر بەردەوام بوو و فەرمووی: کاتێک هەموو گەلەکان کۆکرانەوە لە ڕۆژی دواییدا فریشتەیەک بانگەواز دەکات و دەڵێ: با هەموو گەلێک بچێتە لای ئەو شتەی کە لە دنیادا پەرستوویەتی. پاشان هەر کەسێک غەیری خوای تاک و تەنیای پەرستبێ، لە بت و سەنەم، فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر. تەنیا ئەوانە دەمێننەوە کە خوایان بە تەنیا پەرستووە. جا بە چاک و خراپیانەوە، لەگەل بەشێکیش لە ئەهلی کیتاب. ئینجا بانگی جوولەکەکان دەکرێ و پێیان دەگوترێ: لە

---

[4] پەسڵان: ڕۆژی دوایی. قیامەت.

دنیادا کێتان پەرست؟ ئەوانیش دەڵێن: عوزەیری کوڕی خوامان پەرست، پێیان دەگوترێ: درۆتان کرد خوا نە کوڕی هەیە نە هاوەڵ و هاوڕێ. ئینجا پێیان دەگوترێ: ئێستا بڵێن چیتان دەوێ؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگار! تینوومانە و ئاومان دەوێ. دواتر خوا دۆزەخیان وەکوو تراویلکە (سەراب)ێک پێشان دەدا. ئینجا بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن و لەپڕ هەموویان بەسەر یەکدا دەکەون. پاشان بانگی گاورەکان دەکرێت و پێیان دەگوترێ: لە دنیادا کێتان پەرست؟ ئەوانیش دەڵێن: عیسای کوڕی خوامان پەرست. پێیان دەگوترێ: درۆتان کرد، خوا نە کوڕی هەیە نە هاوەڵ و هاوڕێ. ئینجا پێیان دەگوترێ: ئێستا بڵێن چیتان دەوێ؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگار! تینوومانە، ئینجا خوا دۆزەخیان وەکوو تراویلکە (سەراب)ێک پێشان دەدا. دواتر بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن و لەپڕ هەموویان بەسەر یەکدا دەکەون. ئینجا خوای گەورە لە شێوەیەکدا دێتە لایان کە نایناسن و ئەو شێوەیە لە خوا ناوەشێتەوە. پێیان دەفەرمووێ: چاوەڕێی چیی دەکەن لە کاتێکدا هەموو گەلان شوێن ئەو شتە کەوتن کە لە دنیا پەرستوویانە؟ ئێوە بۆ هەر لە شوێنی خۆتانن؟ ئەوانیش دەڵێن ئەی پەروەردگار! ئێمە لە دنیا لەو کۆمەڵانە دوور کەوتینەوە و هاوڕێیەتیمان نەکردن لە کاتێکدا زۆریش پێویستمان پێیان بوو. ئینجا لەسەر ئەو شێوەیەی کە هات بۆ لایان پێیان دەفەرمووێ: من پەروەردگارتانم! ئەوانیش دەڵێن: پەنا بە خوا لەوەی تۆ پەروەردگارمان بی، ئێمە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نادەین. دوو بۆ سێ جار هەمان قسە دووبارە دەکەنەوە. هەتا ئەو ڕاددەیەی هەندێکیان دەکەونە گومانەوە و خەریکە باوەڕ و ئیمانیان لەق بێ. پاشان خوا پێیان دەفەرمووێ:

ئایا هیچ نیشانەیەک هەیە کە بتوانن خوای پێ بناسنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ. ئینجا خوا لاقی خۆی لە شێوەی نوورێک دەردەخات، لەوکاتەدا ئەوەی لە دنیادا بە پاکی کڕنووشی بردبێ، لەوێش خوا ئیزنی کڕنووشبردنی پێ دەدا. ئەوەشی لە دنیادا بۆ ڕیایی و خۆدەرخستن کڕنووشی بردبێ پشتی ڕەق دەبێ و ناتوانێ کڕنووش ببات. ئینجا ئیماندارەکان سەریان بەرز دەکەنەوە. لەو کاتەشدا خوا بە شێوەی ڕاستەقینەی خۆی خۆیان پێشان دەدات و پێیان دەفەرمووێ: من پەروەردگاری ئێوەم. ئەوانیش دەیناسن و دەزانن ئەو شێوەیە لایەق و شایەنی پەروەردگارە، بۆیە دەڵێن: بەڵێ، تۆ پەروەردگاری ئێمەی. لە دوای ئەوە پردێک لەسەر دۆزەخ دادەنرێ و دواتر ڕێگە بە تکا (شەفاعەت) دەدرێ. پێغەمبەران هەموویان دەڵێن: ((اللهم سلم اللهم سلم)) هەموویان لە خەمی خۆیاندان و خواخوایانە خۆیان بە سەلامەتی ڕزگاریان بێ. ئینجا هاوەڵان گوتیان ئەی پێغەمبەر ئەو پردە چییە و چۆنە؟

پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرمووی: ((پردێکی لووسە و پێیەکان لەسەری هەڵدەخلیسکێن. قولاپ و جۆرێک لە کەڵبەی فڕێنەری بەسەرەوەیە، کە وەکوو دڕکی سەعدان[٥] وایە. جگە لەوەی خوا نەبێ کەس ئەندازەی گەورەیی و زەبەلاحییەکەی نازانێ. ئەوانەی زۆر ئیماندار و چاکەکارن لە چاوترووکانێکدا بەسەر ئەو پردەدا تێدەپەڕن. هەندێکی دیکە وەکوو برووسکەیەک بەسەریدا تێدەپەڕن. هەندێکی دیکە وەکوو -با-و هەندێکی دیکە وەکوو باڵندە و هەندێکیش وەکوو ئەسپسوار

---

[٥] جۆرێکی دڕکە، کە لە شاری "نجس"ی سعوودیە دەڕوێ. وەرگێڕ

بەسـەریدا دەڕۆن. هەنـدێکیان بە سـەلامەتی ڕزگاریـان دەبـێ و دەپەڕنەوە بـۆ بەهەشـت. هەنـدێکی دیـکە زۆر بەزەحـمەت و بەزامـداری ڕزگاریـان دەبێـت و دەپەڕنەوە بـۆ بەهەشـت. هەندێکیشیان ئەو کەڵبە و قولابانە دەیانفڕێنن و فڕێیان دەدەنە نـاو دۆزەخ. هەتـا ئەوکـاتەی ئیمانـدارەکان لە ئـاگر ڕزگاریـان دەبێت و هەموویان دەپەڕنەوە. سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەسـتە، کەس لە ئێـوە ئەوەنـدەی ئیمانـدارە بەهەشـتییەکانی ئەوکـات بە خەم نیـیە بـۆ تکـا کـردن لە پەروەردگـار بـۆ ڕزگـارکردنی براکانیـان لە ئـاگری دۆزەخ. داوا لە پەروەردگـار دەکەن و دەڵێن: ئەی پەروەردگار ئەوانە لەگەڵ ئێمەدا بەڕۆژوو دەبوون و نوێژیان دەکرد و حەجیان دەکرد. ئینجا خوا پێیان دەفەرمـووێ: بـڕۆن کێتـان ناسـی دەری بهێنن چونکە حەرامـم کردووە ئاگر ڕووخساری ئەوانە بسوتێنێ. ئینجا دەچن کۆمەڵە کەسـێکی یەکجـار زۆر دەردێنن، کە ئـی وایـان هەیە هەتـا لاقـی کەوتۆتە ناو ئاگر و هی واشیان هەیە هەتا ئەژنۆی کەوتۆتە نـاو ئـاگر. ئینجـا دەڵـێن: ئەی پەروەردگـار! ئەوەنـدەی فەرمانـت پـێ کردبـووین دەرمـان هێنـان. پەروەردگـار پێیـان دەفەرمـووێ: بگەڕێـنەوە و ئەوەی تۆزقاڵێـک چـاکە لە دڵیـدا بـوو دەری بێـنن. ئەوانیش دەگەڕێنەوە و خەڵکێکی زۆری دیکە لە ئاگر دەردێنن و پاشـان دەڵـێن: ئەی پەروەردگـار! ئەوەنـدەی فەرمانـت پـێ کردبووین دەرمان هێنان. ئینجا پەروەردگار پێیان دەفەرمووێ: بگەڕێنەوە و ئەوەی بە ئەندازەی نیوەتۆزقاڵێک لە دڵیدا هەبوو، دەری بهێـنن. ئەوانـیش دەگەڕێـنەوە و خەڵکێکـی زۆری دیـکە دەردێنن و پاشـان دەڵێن: ئەی پەروەردگـار ئەوەنـدەی فەرمانـت پـێ کردبـووین دەرمـان هێنـان. پاشـان پەروەردگـار پێیـان

دەفەرمـووێ: بگەڕێـنەوە و ئەوەی مسـقاڵە زەڕڕەیەک چـاکە لە دڵی دابوو دەری بهێنن. ئەوانیش خەڵکێکی زۆری دیکە دەردێنن و پاشـان دەڵـێن: ئەی پەروەردگـار! ئەوەی مسـقاڵە زەڕڕەیەک خێر لە دڵی دابوو دەرمان هێنا.))

ئەبو سەعیدی خودری کە گێڕەرەوەی فەرموودەکەیە خوا لێی ڕازی بێ دەفەرمووێ: ئەگەر باوەڕ بەو حەدیسە ناکەن بڕۆن ئەو ئایەتە بخوێننەوە کە خودا دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٤٠﴾ ﴾ النساء: ٤٠

واتە: بێگومان خودا بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕڕەیەکیش زوڵم و ستەم لە هـیچ کەسـێک ناکـات. ئەگەر چاکەشـی کردبێ بـۆی دەکاتە دوو ئەوەندە و لە لایەن خۆیەوە ئەجر و پاداشتێکی زۆر دەدات بە بەنـدەکانی. لە پاشـاندا پەروەردگـار دەفەرمـووێ: فریشـتەکان شـەفاعەتیان کـرد، پێغەمـبەران شـەفاعەتیان کـرد، ئیمانداران شەفاعەتیان کرد، کەس نەماوە شـەفاعەت بکا جگە لە پەروەردگاری بەخشندە و دلۆڤان. ئینجا چنگێک بە چنگی خۆی لە دۆزەخ دەدات و کۆمەڵێـک کەس دەردێنـێ کە لە هەمـوو تەمەنیانـدا چاکەیەکیـان نەکـردووە، ئەوەنـدە سـووتاون لەنـاو ئاگردا پێستیان وەک خەڵووز ڕەش بووە. پاشـان دەیانخـاتە نـاو ڕووبـارێکەوە لە نزیـک دەرگـای بەهەشـت، کە پێـی دەگـوترێ "ڕووبـاری ژیـان" کاتێـک لەو ڕووبـارە دێـنە دەرەوە، سـەوز دەبنەوە وەک چۆن تۆوێک لەناو لیتەی لافاودا سـەوز دەبێت. ئایـا چەکەرەی ئەو تـۆوە لەسـەر بەرد یـان دار نـابینن؟ ئەوەی

لەبەر خۆر چەکەرەی کردبێ سەوز یان زەرد دەبێ و ئەوەشی لەبەر سێبەردا چەکەرەی کردبێ، سپییە. هاوەڵان بە سەرسوڕمانەوە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا دەڵێی تۆ لەو دەشتە شوانیت کردووە؟!

دواتر پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرمووی: " ئەو کۆمەڵە وەکوو مرواری وان و گەردەنیان مۆرێکی پێوەیە. خەڵکی بەهەشت بەو مۆرە دەیانناسنەوە و دەڵێن: ئا ئەوانە خوا لێیان خۆش بووە و خستوونییەتە بەهەشت بەبێ ئەوەی یەک کاری چاکیان کردبێ لە دنیادا. پاشان پەروەردگار پێیان دەفەرمووێ: بڕۆنە بەهەشت. کاتێک دەچنە بەهەشت کۆشک و تەلار و باخ و باخاتێکی زۆر دەبینن. پەروەردگار پێیان دەفەرمووێ: ئەوەی دەیبینن، هەموو بۆ ئێوە ئامادەکراوە و هیی ئێوەیە. ئەوانیش سوپاسی خوا دەکەن و دەڵێن: ئەی پەروەردگار! بە ڕاستی ئەوەی بە ئێمەت بەخشیوە بە کەسی دیکەت نەبەخشیوە. ئینجا پەروەردگار پێیان دەفەرمووێ: بەڵکوو بەخششی زۆر لەوانە باشترم بۆ ئامادەکردوون، ئەوانیش بە سەرسوڕمانەوە دەڵێن: ئەی پەروەردگار! چ شتێک هەیە کە لەوە باشتر بێ؟ پەروەردگار پێیان دەفەرمووێ: ڕەزامەندیی من. وا لێتان ڕازی بووم و هەرگیز لێتان تووڕە نابم)).

هذا حديث صحيح متفق عليه و اللفظ لمسلم.

# سیونۆ

**مرۆڤ دوای مردنی چی بەسەر دێ؟!.**

لە ئەبوهـورەیرەوە دەگێـڕنەوە کە پێغەمـبەر سـەلامی خـوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((کاتێک کەسێک دەمرێت و دەخرێتە ناو گـۆڕ، گـوێی لە دەنگـی پێـی ئەو خەڵـکە دەبـێ کە گـۆڕەکەی بەجێدێڵن. ئەگەر ئەو کەسە بڕوادار بێ، ئەوە چاکەکانی دەچنە لای سەری. ڕۆژووش دێتە لای ڕاستی و زەکاتیش دەچێتە لای چەپی. چاکەکانی دیکەش وەکوو سیلەی ڕەحم و ڕەوشتی جوان و خێر و چاکە دەچنە لای پێیەکانی. ئینجا فریشتەی سزا لە لای سەریەوە بۆی دێن، بەڵام نوێژ ناهێڵێ و ڕێگەیان نادا. ئینجا لە لای ڕاستەوە بـۆی دێـن، بەڵام ڕۆژوو نـاهێڵێ و ڕێگەیـان نـادا. پاشان لە لای چەپیەوە بۆی دێن، بەڵام زەکات ناهێڵێ و ڕێگەیان نادا، پاشـان لە لای پێیەکانیەوە بۆی دێن، بەڵام چاکەکانی وەک سـیلەی ڕەحـم و ڕەوشـتی جـوان و خێـر و چـاکە نـاهێڵن و ڕێگەیان نادەن. پاشان دوو فریشتە دایدەنیشێنن و پرسیاری لێ دەکەن: چی لە بارەی ئەو پیاوەوە دەزانی کە بۆتان ڕەوانە کرا؟ چۆن شـایەتی لەسـەر دەدەی؟ کابرا دەڵێ: جارێ لێم گەڕێ با نوێژێـک بـکەم. نـوێژەکەی دەکـات و دواتـر دوو فریشـتەکە دووبارە لێی دەپرسنەوە: ئێستا بڵێ چی لەبارەی ئەو پیاوەوە دەزانـی کە بۆتـان ڕەوانە کـرا؟ چـۆن شـایەتی لەسـەر دەدەی؟ ئینجا کابرا دەڵێ: ئەو کەسە ناوی موحەممەدە و شـایەتی دەدەم کە پێغەمـبەری خـوایە و بە حەق و ڕاسـتی، ڕەوانە کـراوە لە لایەن خواوە. ئینجا دوو فریشتەکە پێی دەڵێن: ڕاستت کرد، تۆ

لەسەر ئەوە ژیای و لەسەر ئەوە مردی. ئیشەڵڵا لەسەر ئەوەش زیندوو دەکرێیەوە. پاشان دەرگایەکی لە دەرگاکانی بەهەشت بۆ دەکرێتەوە و پێی دەگوترێ: ئەوە جێگە و مەنزڵی تۆیە لە بەهەشت، خوا ئەوەی بۆ ئامادە کردووی، کابرا شاگەشکە دەبێ کاتێک مژدەی بەهەشتی پێ دەدەن. پاشان دەرگایەکی لە دەرگاکانی دۆزەخی بۆ دەکرێتەوە و پێی دەگوترێ: ئەگەر کەسێکی بێ باوەڕ و خراپەکار و دوور لە دین بای، ئەوە جێگەت دەبوو. کابرا ئەوجارەش شاگەشکە دەبێ و زیاتر دڵی خۆش دەبێ بە هۆی ئەوەی خوا لە دۆزەخ پاراستی. ئینجا حەفتا پێ قەبرەکەی بۆ فراوان دەکرێ و بۆشی ڕووناک دەکرێت. دواتر جەستەی دێتەوە شوێنی خۆی و گیانی دەکرێتە ناو بۆنێکی خۆشەوە و وەکوو تەیرێکی بەهەشتی لێ دێ. ئینجا پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ ئەو ئایەتەی خوێندەوە:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم: ٢٧

واتە: "خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دنیادا. لە سەرەمەرگ و لە قیامەتیشدا باوەڕی دامەزراو فریایان دەکەوێت و گوفتاریان ڕێک و پێک و دامەزراو دەبێت و بەئیمانەوە دەمرن. لەولاشەوە هەر ئەو خوایە ستەمکاران گومڕا دەکات و ئەوەی پەروەردگار بیەوێت هەر ئەوە پێش دێت و دەکرێت".

بەڵام کەسی بێباوەڕ و خراپەکار کاتێک دەمرێ هیچ شتێک نییە لە فریای بێ، فریشتەی سزا لە لای سەریەوە بۆی دێن

بەڵام هیچ چاکەیەکی نییە ڕێیان لێ بگرێ. لە لای ڕاستیەوە بۆی دێ، بەڵام هیچ چاکەیەکی نییە ڕێیان لێ بگرێ. لە لای چەپیەوە بۆی دێن، بەڵام هیچ چاکەیەکی نییە ڕێیان لێ بگرێ. لە لای پێیەکانیەوە بۆی دێن، بەڵام هیچ چاکەیەکی نییە ڕێیان لێ بگرێ. پاشان پێی دەگوترێ: دانیشە! ئەویش بە ترسولەرزەوە دادەنیشێ. ئینجا پێی دەڵێن: چی دەزانی لەبارەی ئەو پیاوەی کە بۆتان ڕەوانە کرابوو؟ بەڵام ئەو هەر ناویشی نازانێ تا ئەوکاتەی ناوی موحەممەد دەهێنن. ئینجا دەڵێ: نازانم تەنیا گوێم لە خەڵک بوو، کە شتێکیان دەگوت منیش هەمان شتی ئەوانم دەگوتەوە. ئینجا پێی دەگوترێ: لەسەر ئەوە ژیای و لەسەر ئەوە مردی و ئیشەڵڵا لەسەر ئەوەش زیندوو دەکرێیەوە. پاشان دەرگایەک لە دەرگاکانی دۆزەخی بۆ دەکرێتەوە و پێی دەگوترێ: ئێرە جێگە و شوێنی تۆیە و خوا بە هۆی بێ باوەڕی و کارە خراپەکانت ئێرەی بۆ ئامادە کردووی. ئینجا کابرا ئاهـ و حەسرەت هەڵدەکێشێ و خەم دایدەگرێ. پاشان دەرگایەک لە دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە و پێی دەگوترێ: ئەگەر کەسێکی باوەڕدار و چاکەکار بای، ئەوە جێگە و مەنزڵی تۆ دەبوو و خوا ئێرەی بۆ ئامادە کردبووی. دووبارە خەم دایدەگرێت و ئاهـ و حەسرەت هەڵدەکێشێ. پاشان گۆڕەکەی لێ تەنگ دەکرێ هەتا ئێسکەکانی تێکدەشکێن. ئەوەش ئەو ژیانە تەنگەیە کە خوا باسی دەکا:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه: ١٢٤

واتە: "ئـەوەیش ڕوو وەربگێڕێـت لـە بەرنامـە و یـادی مـن و پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسـانە ژیانێکی تـرش و تـاڵ و ناخۆشـیان دێێـتە پـێش. لـە ڕۆژی قیامەتیشـدا بـەکوێری حەشری دەکرێن".

هذا حدیث صحیح اخرجە ابن حبان فی صحیحە و اللفظ لە و الطبرانی فی الاوسط و زاد

# چل

## گەورەترین شەفاعەت لە ڕۆژی دوایدا.

ئەبوهـوڕەیرە خـوا لێی ڕازی بێ ،دەگێـڕێتەوە و دەفەرمـووێ: ڕۆژێکیـان ئـاژەڵێکی برژاویـان بۆ پێغەمبەر هێنـا سـەلامی خوای لەسەر بێ، پێغەمبەر حەزی چووە باڵەکەی، پاشان هەڵی گرت و بە ددانـی گـازێکی لـێ گـرت و دواتـر فەرمـووی: ((مـن گەورەی خەڵکیم لە ڕۆژی دواییدا. دەزانن هۆکاری ئەوەش چییە؟خوا لە ڕۆژی دوایــدا هەمــوو خەڵکــی لە شــوێنێک کۆدەکــاتەوە هەر کەسێک قسە بکات، هەموو خەڵکی گوێیان لـێ دەبێت و دەیبینن. لەوکـاتەدا خـۆر ئەوەنـدە لە خەڵکی نزیـک دەبێتەوە، کە خەڵکی تووشــی نـاڕەحەتی و دڵتەنگییەکـی وا دەکـات، کە بەرگەگرتنـی ئەسـتەمە. پاشـان کۆمەڵێـک لە خەڵکـی کـۆدەبنەوە و بە یەکتـر دەڵـێن: ئەرێ ئەوە نـابینن لەنـاو چ نـارەحەتییەک دایـن؟ نـابینن چیمان بەسەرهاتووە؟ بەنیاز نیین بڕۆن بۆ لای کەسێک کە تکا (شــەفاعەت)مان بـۆ بکـا لە لای پەروەردگـار و لەو نـاڕەحەتییە ڕزگارمان بکات؟ ئینجا هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن: بـڕۆن بـۆ لای ئـادەم. ئەوانـیش دەچـن بـۆ لای ئـادەم و پێـی دەڵـێن: ئەی ئـادەم تـۆ بـاوکی مرۆڤـایەتی و خـوا بە دەسـتی خـۆی دروسـتی کردووی و لە روحی خۆی روحی بەبەردا کردووی. فەرمانیشـی بە فریشتەکان کرد کە کڕنووشـت بـۆ بەرن. هـاتووین بـۆ لات تـا تکامان لە لای خوا بۆ بکەی و لەو بارودۆخە سـەختە ڕزگارمـان بــکەی. نــابینی لە چ نــاڕەحەتییەک دایــن؟ نــابینی چیمــان بەســەرهاتووە و چەن شــەکەت و مانــدووین؟ ئینجــا ئــادەم

دەفەرمووێ: بەڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگار بە شێوەیەک تووڕەیە کە نە لە پێشتر ئاوا تووڕە بووە و نە لەمەودواش جارێکی دیکە ئاوا تووڕە دەبێ. ئینجا من بێفەرمانیی خوام کرد و لەو درەختە قەدەغەکراوەم خوارد. بۆیە ناتوانم تکاتان بۆ بکەم. خۆم خۆم (نفسی نفسی). بڕۆنە لای کەسێکی دیکە، بڕۆنە لای نووح. ئینجا دەچنە لای نووح و پێی دەڵێن: ئەی نووح! تۆ یەکەم نێردراوی خوای بۆ سەر زەوی و خواش بە بەندەیەکی شوکرانەبژێر ناوی هێناوی. هاتووینە لات تاکو تکامان لە لای خوا بۆ بکەی و لەو بارودۆخە ڕزگارمان بکەی. نابینی لە چ نارەحەتییەک داین؟ نابینی چیمان بەسەرهاتووە و چەن شەکەت و ماندووین؟ ئینجا نووح دەفەرمووێ: بەجڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگار بەشێوەیەک تورەیە کە نە لە پێشتر ئاوا تووڕە بووە و نە لەمەودواش جارێکی دیکە ئاوا تووڕە دەبێ. منیش لە دنیادا تکا و پاڕانەوەی خۆم پێ درا و ئەویش ئەوەبوو کە نزام لە گەلەکەم کرد و خوا نقوومی کردن. خۆم خۆم (نفسی نفسی) بڕۆنە لای ئیبڕاهیم. ئینجا دەچنە لای ئیبڕاهیم و پێی دەڵێن: ئەی ئیبڕاهیم تۆ پێغەمبەر و خۆشەویستی خوا بووی لەسەر زەوی، هاتووین بۆ لات تا تکامان لە لای خوا بۆ بکەی و لەو بارودۆخە ڕزگارمان بکەی، نابینی لە چ نارەحەتییەک داین؟ نابینی چیمان بەسەرهاتووە و چەن شەکەت و ماندووین؟ ئینجا ئیبڕاهیم دەفەرمووێ: بەڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگار بەشێوەیەک تووڕەیە کە نە لە پێشتر ئاوا تووڕە بووە و نە لەمەودواش جارێکی دیکە ئاوا تووڕە دەبێ. ئینجا باسی سێ درۆیەکەی دەکا لە دنیادا، ئەویش بەهەمان شێوە دەڵێ: خۆم خۆم (نفسی نفسی) بڕۆنە لای کەسێکی دیکە، بڕۆنە لای مووسا. ئەوانیش دەچنە لای

مووسا و پێی دەڵێن: ئەی مووسا! تۆ پێغەمبەری خوای و خوا بە هۆی نامەکانی تەورات و قسەکردن لەگەڵت جیای کردویوەوە لەوانی دیکە. هاتووین بۆ لات تا تکامان لە خوا بۆ بکەی و لەو بارودۆخە ڕزگارمان بکەی. نابینی لە چ نارەحەتیەک داین؟ نابینی چیمان بەسەرهاتووە و چەند شەکەت و ماندووین؟ ئینجا مووسا دەفەرمووێ: بە ڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگار بەشێوەیەک توورەیە کە نە لە پێشتر ئاوا توورە بووە و نە لەمەودواش جارێکی دیکە ئاوا توورە دەبێ. منیش کەسێکم کوشت کە نەدەبوو بیکوژم. خۆم خۆم (نفسی نفسی) بڕۆنە لای عیسا. ئەوانیش دەچن بۆ لای عیسا و پێی دەڵێن: ئەی عیسا تۆ پێغەمبەری خوای و لە لانکەدا قسەت لەگەڵ خەڵکی کردووە، خوا بە تایبەت روحی بەبەر مەریەمدا کردووە و تۆی هێناوەتە بوون. هاتووین بۆ لات تا تکامان لە خوا بۆ بکەی و لەو بارودۆخە ڕزگارمان بکەی. نابینی لە چ نارەحەتیەک داین؟ نابینی چیمان بەسەرهاتووە و چەند شەکەت و ماندووین؟ ئینجا عیسا دەفەرمووێ: بە ڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگار بەشێوەیەک توورەیە کە نە لە پێشتر ئاوا توورە بووە و نە لەمەودواش جارێکی دیکە ئاوا توورە دەبێ. بەڵام عیسا جیا لە پێغەمبەرانی دیکە باسی هیچ هەڵەیەکی خۆی نەکرد و دواتر گوتی: خۆم خۆم (نفسی نفسی) بڕۆنە لای کەسێکی دیکە. بڕۆنە لای موحەممەد. ئەوانیش دێن بۆ لای من و پێم دەڵێن: ئەی موحەممەد تۆ پێغەمبەری خوایت و کۆتا نێردراوی خوای بۆ سەر زەوی. خوا لە یەکەم و کۆتا تاوانت خۆش بووە. هاتووین بۆ لات تا تکامان لە خوا بۆ بکەی و لەو بارودۆخە ڕزگارمان بکەی، نابینی لە چ نارەحەتییەک داین؟ نابینی چیمان

بەسـەرهاتووە و چەنـد شـەکەت و مانـدووین؟ ئینجـا مـن بەرێدەکەوم و دەچم بۆ ژێر عەرشی پەروەردگار. دواتر بە کڕنووشدا دەکەوم و زۆر بە خشووعەوە لە خوا دەپاڕێمەوە، کە ئەو خەڵکە لەو بارودۆخە ناڕەحەتە ڕزگار بکات. پاشان خوا وەڵامم دەداتەوە و تکا و پارانەوەکانم گیرا دەکا. سوپاس و ستایشیشم دەکات، کە پێش من ئەو سوپاس و ستایشە بە هیچ کەسێکی دیکە نەدراوە. پاشان لە لایەن خواوە بانگم دەکرێ و پێم دەگوترێ: ئەی موحەممەد سەرت بەرزبکەوە، داوام لێ بکە با پێت ببەخشم و تکا بکە با بۆت گیرا بکەم. ئینجا سەرم بەرز دەکەمەوە و دەڵێم: ئەی پەروەردگار! گەلەکەم، گەلەکەم. پاشان دووبارە لە لایەن خواوە بانگ دەکرێم و پێم دەگوترێ: ئەی موحەممەد! بڕۆ کۆمەڵێکی بێشومار لە دەرگای ڕاستی دەرگاکانی بەهەشت ببە بەهەشت، گەلانی دیکەش با لە دەرگاکانی دیکەوە بچنە بەهەشت. سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، دووریی نێوان دەرگایەک لە دەرگاکانی بەهەشت هێندەی دووریی نێوان مەککە و هەجەر یان مەکە و بەسرایە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

# چلویەک

## بەگژیەکداچوونی حەزرەتی مووسا و حەزرەتی ئادەم.

لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((مووسا و ئادەم بەگژیەکداچوون، مووسا بە ئادەمی گوت: ئەی ئادەم ئەتۆ باوکی ئێمەی، بێهیوات کردین و لە بەهەشت دەرت کردین. ئادەم وەڵامی دایەوە و گوتی: ئەی مووسا! ئەتۆ کەلیموڵلای و خوا بۆ خۆی ڕێگەی پێشانداوی. لەسەر کارێک لۆمەم دەکەی کە چل ساڵ پێش ئەوەی خوا دروستم بکات ئەو قەدەرەی بۆ دانابووم؟ ئینجا ئادەم هەر بیانووی هێنایەوە و بیانووی هێنایەوە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

## چلودوو

**ئەو چوار کەسەی لە قیامەت شکایەتی حاڵی خۆیان دەکەن لای خوا.**

لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: (( چوار کەس لە دواڕۆژدا لای خوا سکاڵا دەکەن، پیاوێکی کەڕ، کە هیچ نابیستێ. پیاوێکی شێت. پیاوێکی پیری خەڵەفاو. پیاوێکیش کە پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام بێت وەفاتی کردووە و مردووە. ئینجا لە قیامەت کابرای کەڕ دەڵێت: ئەی پەروەردگار! ئەوکاتەی ئیسلام هات من کەڕ بووم و هیچم نەدەبیست. کابرای شێتیش دەڵێت: ئەی پەروەردگار! ئەوکاتەی کە ئیسلام هات، من شێت بووم و لە هیچ تێنەدەگەیشتم. منداڵ قشپل و پیساییان پێدا دەدام. کابرای پیری خەڵەفاویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار! ئەوکاتەی کە ئیسلام هات من توانای تێگەیشتنم نەمابوو. ئەوە پیاوەش کە پێش هاتنی ئیسلام مردبوو، دەڵێت: ئەی پەروەردگار ئەوکاتەی من لە ژیاندا بووم، هیچ پێغەمبەرێک و پەیامێک نەهاتبوو. ئینجا خوا تاقییان دەکاتەوە و پەیمانیان لێ وەردەگرێ کە گوێڕایەڵی بکەن. فریشتەیەکیان بۆ دەنێرێت کە پێیان بڵێ: بڕۆنە ناو ئاگر و مەترسن چونکە لەسەرتان سارد و سەلامەت دەبێ، ئەوەشی کە نەچێتە ناوی و بێ فەرمانی خوا بکا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر)).

هذا حديث صحيح ، اخرجه احمد ، والبزار، وابن ابی عاصم فی السنة، والبیهقی فی الاعتقاد، عن ابی هریرة و عن الاسود ابن سریع .

# چلوسی

## ئەو پیاوەی گۆزەیەک ئاڵتوونی لە زەوییەکدا دۆزییەوە.

لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرمووویەتی: ((لە سەردەمانی پێش ئێوەدا پیاوێک زەوییەکی لە پیاوێکی دیکە کڕی. ئەو پیاوەی کە زەوییەکەی کڕیبوو گۆزەیەک لە زێڕی لەناو زەوییەکەدا دیتەوە. گۆزەزێڕەکەی بۆ کابرا بردەوە و پێی گوت: فەرمووو! ئەو گۆزەزێڕە لەناو زەوییەکەتدا بوو. من زەویم لێ کڕیوی نەک گۆزەی زێڕ. کابرای خاوەن زەوییش کە ئەوەی لە کابرا دیت، سەری سوڕما و گوتی: من زەوییەکەم بە هەموو شتێکەوە پێ فرۆشتووی، ئیدی نە ئەم زێڕەکەی دەویست نە ئەوی دیکەش وەری دەگرتەوە. ناچار چوون بۆ لای دانایەک کە کێشەکەیان بۆ چارەسەر بات و حەلێکیان بۆ بدۆزێتەوە. دانایەکە پێی گوتن: ئایا کوڕتان هەیە؟ یەکێکیان گوتی: بەڵێ من کوڕم هەیە. ئەوی دیکەش گوتی: من خزمەتکارێکی کچم هەیە. پیاوە دانایەکە گوتی: کەواتە کچەکە لەو کوڕە مارە بکەن و ئەو زێڕ و گەوهەرانەیان بەسەردا دابەش بکەن. دواتر کوڕە کچەی مارە کرد و زێڕ و گەوهەراتەکەیان بۆ خۆیان سەرف کرد)).

هذا حديث صحيح متفق عليه .

# چلوچوار

## ئەو پیاوەی سەردانی هاوڕێیەکی کرد لە گوندێک.

لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((لە سەردەمانی پێش ئێوەدا پیاوێک وەڕێکەوت بۆ سەردانی هاوڕێیەکی. لە ڕێگادا خوا فریشتەیەکی لەسەر شێوەی مرۆڤ بۆ نارد. کاتێک فریشتەکە پێی گەیشت، لێی پرسیی: ئەی بەندەی خوا! دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟ پیاوەکە گوتی: هاوڕێیەکم لەو گوندەیە، دەمەوێ بڕۆمە لای و سەردانی بکەم. فریشتەکە لێی پرسیی: بۆ ئەوە دەچی کە حەقێکی تۆی بەسەرەوەیە و دەتەوێ لێی وەربگریەوە؟ کابرا گوتی: نەخێر، تەنیا لەبەر خاتری خوا خۆشم دەوێ و دەچم سەردانی دەکەم. ئینجا فریشتەکە گوتی: دەی من لە لایەن خواوە نێردراوم بۆ لات، تا پێت بڵێم وەک چۆن تۆ ئەو کابرایەت لەبەر خاتری خوا خۆش ویست، بەهەمان شێوە خواش تۆی خۆش دەوێ)).

هذا حديث صحيح اخرجه مسلم و احمد.

## چلوپێنج

### خۆشحاڵیی خوا بە تەوبەکردنی بەندەکەی.

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: ((خوا بە تەوبەی بەندەکەی، زۆر لەو پیاوە دڵخۆشترە کە: لە بیابانێکی وشک و بێئاودا بە سواری وشترەکەیەوە کە تورەکەی خواردن و خواردنەوەکەی بەسەرەوەیە دەچێتە شوێنێک بۆ ئەوەی تۆزێک پشوو بدا و سەرخەوێک بشکێنێ. کابرا خەوی لێ دەکەوێت و دواتر کە خەبەری دەبێتەوە وشترەکەی بە هەموو کەلوپەل و خواردن و خواردنەوەکەیەوە ڕۆیشتووە و هیچ ئاسەوار و خەبەرێکیشی نییە. دواتر هەڵدەستێ و دوای دەکەوێ بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە. ماوەیەکی چاک بە دوایدا دەگەڕێ نایدۆزێتەوە. بۆیە بێهیوا دەبێ و تینوویێتیش تینی بۆ دێنێ. پاشان دەڵێ: دەگەڕێمەوە بۆ ئەو جێیەی کە پشووم لێی دا و بۆ خۆم لەوێ لێی دەنوومەوە هەتا دەمرم. ئینجا دەچێتەوە شوێنی خۆی و سەری لەسەری باسکی دادەنێ و خەوی لێ دەکەوێ. لەناکاو خەبەری دەبێتەوە و چاوی هەڵدێنێ. دەبینێ وشترەکەی بە بار و خواردن و خواردنەوەکەیەوە گەڕاوەتەوە. ئەو پیاوە چەندە دڵخۆشە! خوا زۆر لەو دڵخۆشترە بە تەوبەکردنی بەندەکەی و گەڕانەوەی بۆ لای خوا. لە گێڕانەوەیەکی تریشدا هاتووە کە، ئەو کاتەی چاوی هەڵدێنێ و وشترەکەی دەبینێ شاگەشکە دەبێ و دەڵێت: خوایە تۆ عەبدی منی و من خوای تۆم. ئەوەندە دڵخۆش دەبێ! تووشی ئەو

هەڵەیەش دەبـــێ، بەڵام خـــوا لێـــی نـــاگرێ و دەزانـــێ لە چ بارودۆخێک دایە)).

هذا حديث صحيح متفق عليه

و فى الباب عن ابى هريرة ، و النعمان بن البشير ، و البراء بن عازب و انس ابن المالک رضى الله عنهم .

# چلوشەش

## دەرچوونی مەسیحی دەجاڵ.

ئەواسی کوڕی سەمعان خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ((بەیانییەکیان پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ باسی دەجاڵی کرد. لە کاتی باسکردنی ئەوەندە هەڵدەستا و دادەنیشت و بەجۆشوخرۆشەوە لێی دەدوا، تا ئەو کاتەی وامانزانی لەناو دارخورماکانی مەدینەدایە. دواتر کە چووینەوە لای پێغەمبەر، زانیی ترسمان لێ نیشتووە و کارەکەمان زۆر بە جددی وەرگرتووە. بۆیە گوتی: ئەوە چیتانە؟! گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەندە بەجۆشوخرۆشەوە باسی دەجاڵت کرد، کە وامانزانی ئێستا لەناو دارخورماکانی مەدینەدایە. ئینجا پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ فەرمووی: ((شتی دیکە هەیە جگە لە دەجاڵ کە دەترسم تووشتان بێ، ئەگەر دەجاڵ هات و من لە ناوتاندا بووم، ئەوە من خۆم بەرەنگاری دەبمەوە و ناهێڵم زەفەرتان پێ ببا. خۆ ئەگەر منیش لە ناوتاندا نەبووم، ئەوە هەرکەسە و دەبێ بۆ خۆی خەم لە خۆی بخوات و خواش یارمەتیدەرتان دەبێ. دەجاڵ گەنجێکە کە چاوێکی دەرپەڕیوە. هەست دەکەم شێوەی زۆر لە "عەبد العزی بن قطن" دەکات. لە سەردەمی هەر کەسێکتاندا هات با ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی ((کهف)) بخوێنێ تا نەتوانێ زەفەری پێ ببات. دەجاڵ لە شوێنێک دەردەچێ لە نێوان عێراق و شامدا، ئینجا بە ڕاست و چەپدا خراپەکاری دەکات. وریا بن و خۆڕاگر بن ئەی بەندەکانی خوا))).

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ماوەی مانەوەی لەسەر زەوی چەندە؟

گوتی: (( چل ڕۆژە، ڕۆژی یەکەمیان بەقەد ساڵێکە، ڕۆژی دووەمیان بەقەد مانگێکە، ڕۆژی سێیەمیان بەقەد هەفتەیەکە، ڕۆژەکانی دیکەش وەک و ڕۆژی ئاسایی وان)).

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو ڕۆژەی کە بەقەد ساڵێکە نوێژی یەک ڕۆژ بکەین؟ گوتی: نەخێر ئەندازەی بگرن، واتە: هەر بیست و چوار سەعات بە شەو ڕۆژێک حساب بکەن و پێنج نوێژی تێدا بکەن. وتمان ئەی خێرایی گەڕانی بە سەر زەویدا چۆنە؟ پێغەمبەر فەرمووی: خێرایی گەڕانی بە سەر زەویدا وەکوو بارانێک وایە کە با دوای کەوتبێ، ئینجا بە لای کۆمەڵێک کەسدا تێدەپەڕێ و بانگیان دەکا کە باوەڕی پێ بهێنن، ئەوانیش باوەڕی پێ دەهێنن و بەدەم بانگەوازەکەیەوە دەچن. لەو کاتەدا دەجاڵ ئەمر بە ئاسمان دەکات باران دەبارێت و ئەمر بە زەوی دەکا ئەویش سەوزایی و بەروبوومەکانی هەموو دەردەکا و مەڕ و ماڵاتی ئەو خەڵکە هەموو تێر و پڕ شیر دەبن. دواتر بە لای کۆمەڵێک کەسی دیکەدا تێدەپەڕێ و بانگیان دەکا کە باوەڕی پێ بهێنن، بەڵام ئەوان باوەڕی پێ ناهێنن و بەدەمییەوە ناچن. ئەویش هەرچی زێڕ و زیو و سەروەت و سامانی هەیانە لەگەڵ خۆی دەبیات و هیچیان بەدەستەوە نامێنێ، دواتر بە لای کەلاوەیەکدا تێدەپەڕێ و فەرمان بە کەلاوەکە دەکات و دەڵێ: گەنجینەکانت دەربێنە، ئینجا هەرچی گەنجینەی ئەو شوێنە هەیە دێتە دەر و وەکوو مێروولە بەڕیز دوای دەکەون. پاشان بانگی گەنجێکی جوان و ڕێک دەکات،

ئەویش دێت و لەبەردەمی ڕاددەوەستێ. ئینجا شمشێر دەردێنێ و لە سەری گەنجەکەی دەدا دەیکاتە دوو لەت، پاشان بانگی گەنجەکە دەکات، ئەویش هەڵدەستێتەوە و بە هەلهەلە و پێکەنینەوە بەرەو ڕووی دێ. لەوکاتەدا عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوای لەسەر بێ لە ئاسمانەوە دادەبەزێ بۆ لای منارە سپییەکەی ڕۆژهەڵاتی "دیمەشق" لەپێی دەستی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە. کاتێک سەری بەرز و نەوی دەکات، دڵۆپەئاو لە شێوەی دەنکە مرواری لە پرچی دەتکێت. هەر کەسێکی بێباوەڕ بۆنی هەناسەی عیسا بکات، دەستبەجێ گیان لەدەست دەدات. بۆنی هەناسەکەشی لەو شوێنە کۆتایی دێ، کە ئاوڕی بۆ دەداتەوە. واتە: هەتا ئەو شوێنەی چاو بڕ بکات بۆنی هەناسەی دەڕوات. ئینجا دوای دەجاڵ دەکەوێ هەتا لە دەروازەی "لەد" لە فەلەستین دەیگرێ و دەیکوژێ. دواتر عیسا سەلامی خوای لەسەر بێ دەچێتە لای کۆمەڵێک موسوڵمان کە خوا پاکی کردوونەتەوە و بۆ خوا یەکلایی بوونەتەوە. دەست بە ڕووخساریاندا دەهێنێ و باسی پلە و دەرەجاتی بەهەشتیان بۆ دەکا. لەوکاتەدا کە عیسا قسە بۆ موسوڵمانەکان دەکا خوا وەحی بۆ دەکات کە ئەی عیسا من کۆمەڵە بەندەیەکم ناردووەتە سەر زەوی کە هیچ کەسێک ناتوانێ بەرەنگاریان بێتەوە و دەرەقەتیان بێ. خۆت و بەندەکانم ببە سەر کێوی ((طور)) بۆ ئەوەی پارێزراو بن، ئینجا خوا یەئجووج و مەئجووج ڕەوانە دەکات و لە هەموو بەرزاییەک دێنەخوارەوە. سەرەتاکەیان بە دەریاچەی ((طبریە)) دا تێدەپەڕن و هەموو ئاوەکەی دەخۆنەوە هەتا وای لێ دێ ئەوانەی کۆتایی کە پێیدا تێپەڕ دەبن دەڵێن: پێدەچێ پێشتر لێرە ئاوی لێ بووبێ، ئینجا یەئجووج و مەئجووج

حەزرەتی عیسا و موسوڵمانەکان دەورە دەدەن، هەتا وای لێ دێ ئەوەندە برسی و هیلاک دەبن، کە سەری گایەک لە سەد دیناری ئێستای ئێوە بەنرختر دەبێ لایان. حەزرەتی عیسا و موسوڵمانەکان دەست بۆ ئاسمان بەرز دەکەنەوە، لە خوا دەپاڕێنەوە تا لەناویان ببات. ئینجا خوا جۆرە کرمێک دەخاتە ملیانەوە و هەموویان بەیەک جار دەمرن. دواتر حەزرەتی عیسا و موسوڵمانەکان لە کێوی ((طور)) دادەبەزن و سەیر دەکەن بستە زەویــیەک نەماوە کە جەستەی بۆگەنیوی ئەوانە داینەپۆشیبێ. دووبارە حەزرەتی عیسا و موسوڵمانەکان لە خوا دەپاڕێنەوە کە خوا ئەو جەستە بۆگەنیوانەیان لەکۆڵ بکاتەوە. ئینجا خوا جۆرە تەیرێکیان بۆ دەنێرێ کە ملیان وەک ملی وشتر وایە، هەڵیان دەگرن و دەیانبەن بۆ جێگایەک کە هەر خوا خۆی دەزانێ کوێیە. دوای ئەوە خوا بارانێک دەبارێنێ کە هیچ کونوکەلەبەرێک نامێنێ نەچێتە ناوی و تەڕی نەکات. بەو بارانە زەوی دەشواتەوە و پاکی دەکاتەوە لە پیسی و بۆگەنیوی کەلاکی یەئجووج و مەئجووج. پاشان خوا ئەمر بە زەوی دەکات کە هەرچی بەرەکەت و بەروبوومی هەیە دەری بکات. لەو ڕۆژەدا کۆمەڵە کەسێکی زۆر بەیەکەوە بە تاقە هەنارێک تێر دەبن و لە ژێر سێبەری توێکڵەکەی دادەنیشن، دواتر خوا بەرەکەت دەخاتە مەڕومالات و شیرەکەیان. هەتا وای لێ دێ شیری یەک مانگا بەشی کۆمەڵە کەسێکی زۆر دەکات. شیری مەڕ و بزنێک بەشی یەک خێزان دەکات. لەو کاتەدا کە خەڵک ئاوا لە خۆشی و ناز و نیعمەتدایە، خوا شنەبایەکی فێنک هەڵدەکات، کە بۆنێکی خۆشی لێ دێت، ئینجا لە بن باڵیان دەدات و گیانی هەموو باوەڕدارێک دەکێشێ. دواتر تەنیا خەڵکە خراپ

و شـەهوەتباز و سـتەمكارەكە دەمێـنـنەوە و پەنـا بە خـوا وەكـوو گوێـدرێژ لەبەر چـاوی يەكتـر سـواری يەک دەبـن. ئينجـا دنيـا بەسەر ئەوانەدا دەڕوخێت و قيامەت دێت)).

هذا حديث صحيح اخرجه مسلم و ترمذی و ابن ماجة و احمد و غيرهم .

# چلوحەوت

## تەمیمی داری و جەساسە و مەسیحی دەجاڵ.

عامری کوڕی شەراحیلی شەعبی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێت: داوام لە فاتیمەی کچی قەیس کرد کە خوشکی زوحاکی کوڕی قەیسە و لەو کۆچبەرانە بوو، کە یەکەمجار هاتنە مەدینە. پێم گوت: فەرموودەیەکی پێغەمبەرم بۆ باس بکات، کە لە خودی خۆیت گوێ لێ بووبێ، نەک لە هاوەڵان، ئەویش گوتی: باشە، ئەگەر بتەوێ بۆت باس دەکەم. منیش پێم گوت: باشە بۆم باس بکە. ئینجا فاتیمە دەستی بە قسەکردن کردەوە و گوتی: لە ئیبن موغەیرە مارە کرام کە یەکێک بوو لە گەنجە هەرە باشەکانی ئەوکاتە. دواتر لە یەکەم غەزادا لەگەڵ پێغەمبەر شەهید بوو و گەڕایەوە لای پەروەردگار. دواتر کە بێ پیاو مامەوە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف داوای کردم بۆ هاوەڵێکی پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ. پێغەمبەریش داوای کردم بۆ ئوسامەی کوڕی زەید. ئەوەشم بیستبوو کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((ئەوەی منی خۆش دەوێ با ئوسامەشی خۆش بوێ)). ئینجا کاتێک پێغەمبەر لەوبارەیەوە قسەی لەگەڵ کردم، پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ چۆنت پێ باشە وا بکە. کێت پێ باشە، لەوم مارە بکە. ئینجا پێغەمبەر فەرمووی: بڕۆ بۆ لای "ئوم شوڕەیک". ئوم شوڕەیک ژنێکی دەوڵەمەند بوو، لە کۆمەڵی پشتیوانان (الانصار)، زۆر سەخی و دەستکراوە بوو بۆماڵبەخشین لە پێناوی خوادا. منیش چوومە لای ئوم شوڕەیک.

ڕۆژێکیان دوو میوانی هەبوون. منیش گوتم: من دەچم خزمەتیان دەکەم و ئیش و کارەکان دەکەم، بەڵام پێیان گوتم: ((نا تۆ مەچۆ، ئوم شورەیک ئافرەتێکی خانەدانە و بەردەوام میوانی هەیە. پێشمان ناخۆشە کە لەچکەکەت بکەوێ، یان لاقت دەرکەوێ و ئەو میوانانە سەیری شوێنێکت بکەن کە تۆ پێت ناخۆش بێت و پێی بێتاقەت بی. بڕۆ بۆ لای کوڕی مامت عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی ئوم مەکتوم. کە ئەویش پیاوێکە لە هۆزی فیهری قوڕەیش. لەگەڵ ئوم شورەیک لە یەک هۆزن. ئینجا بارگەم گواستەوە بۆ لای عەبدوڵڵا. کاتێک ماوە (عیددە)م تەواو بوو، گوێم لێ بوو بانگبێژی پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ بانگەوازی کرد بۆ نوێژی کۆبوونەوە. ئینجا چووم بۆ مزگەوت و لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژم کرد. من لە ڕیزی دواوە لەگەڵ ئافرەتان بووم. کاتێک پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ لە نوێژ تەواو بوو، لەسەر میمبەر دانیشت و پێدەکەنی. دواتر فەرمووی: هەمووتان لەو جێیەی کە نوێژتان لێ کردووە، دانیشن. پاشان فەرمووی: ((ئایا دەزانن بۆچی بانگم کردوون و کۆم کردوونەتەوە؟)) گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن.

ئینجا فەرمووی: ((بە ڕاستی من بۆ هیچ بۆنەیەکی خۆش یان ناخۆش بانگم نەکردوون، بەڵکوو بۆ ئەوە بانگم کردوون چونکە تەمیمی داری کە کابرایەکی نەسرانی (مەسیحی) بوو، هات و بەیعەتی پێدام و موسوڵمان بوو. شتێکیشی بۆ باس کردم، کە نزیکە لەوەی من بۆم باس کردن لەبارەی مەسیحی دەجال. بۆی گێڕامەوە و گوتی: من و سی کەسی دیکە لە هۆزی "لەخم" و "جوزام" سواری کەشتییەکی دەریایی بووین. لە ڕێگەدا بە هۆی

شەپۆلەوە ڕێمان لێ ون بوو و شەپۆلەکان نزیکەی یەک مانگ لەناو دەریادا یارییان پێ کردین. پاشان چووینە دوورگەیەک و لەوێ لاماندا هەتا کاتی خۆرئاوابوون. ئینجا کەمێک لە نزیک کەشتییەکەمان دانیشتین و پشووماندا، دواتر چووینە ناو دوورگەکە و شتێکی سەیرمان دیت. گیاندارێکی ئەوەندە زل و توکنمان بینی، کە پێش و پاشی لێک جیا نەدەکرایەوە لەبەر تووک. گوتمان واوەیلا بۆ تۆ، تۆ کێی؟ گوتی: من جەساسەم. گوتمان: جەساسە کێیە؟

گوتی: ئەی خەڵکینە بڕۆنە لای ئەو کەسەی لەناو ئەو دێرە (کەنیسە) دایە چونکە زۆر تامەزرۆی ئەوەیە هەواڵی ئێوە بزانێ. کاتێک باسی ئەو پیاوەی کرد، ترساین کە ئەو گیاندارە تووکنە شەیتانێک بێ. دواتر بەپەلە ڕۆیشتینە ناو دێرەکە، کاتێک چووینە ژوورەوە سەیرمان کرد گەورەترین بەشەرمان بینی. پیاوێکی زۆر زل و گەورە! زۆر بە توندی کۆتوبەند کرابوو و دەستەکانی بە زنجیر بە ملییەوە بەسترابوونەوە. نێوان هەردوو ئەژنۆشی هەتا قولەپێی بە ئاسن و زنجیر بەسترابوونەوە. پێمان گوت: واوەیلا بۆ تۆ، تۆ کێی؟ گوتی: ئێوە توانیتان دەستتان بە من بگا، پێم بڵێن ئێوە کێن؟ گوتمان: ئێمە خەڵکێکی عەرەبین، سواری کەشتییەکی دەریایی بووین و لە ڕێگە گێرۆدەی هەڵچوونی دەریا و زۆریی شەپۆلەکانی بووینەوە. دواتر شەپۆلەکان یەک مانگی ڕێک یارییان پێ کردین. پاشان پەنامان بۆ ئەم دوورگەیەی تۆ هێنا. سەرەتا لە لێواری دوورگەکە دانیشتین و دواتر هاتینە ناو دوورگەکە. ئینجا گیاندارێکی گەورە و موودارمان دیت، پێش و پاشی لێک جیا نەدەکرایەوە لەبەر زۆریی موووەکانی. ئینجا پێمان گوت واوەیلا بۆ تۆ، تۆ کێی؟

ئەویش گوتی: من جەساسەم. گوتمان: جەساسە کێیە؟ گوتی: بڕۆنە لای ئەو پیاوەی لەناو ئەو دێرە دایە چونکە بەڕاستی زۆر تامەزرۆی ئەوەیە هەواڵی ئێوە بزانێ. پاشان بەپەلە هاتینە لای تۆ چونکە لەو گیاندارە مووداره ترساین و گوتمان لەوانەیە شەیتان بێ. دواتر ئەو پیاوەی لەناو دێرەکەدا بە زنجیر و ئاسن بەسترابوویەوە، گوتی: هەواڵم بدەنێ لەبارەی دارخورماکانی (بیسان) _شوێنێکە لە شام_ گوتمان: لەبارەی چ شتێکیەوە پرسیار دەکەی؟ گوتی: لەبارەی بەری دارخورماکانی پرسیارتان لێ دەکەم. ئایا بەر دەگرێت؟ گوتمان: بەڵێ، بەر دەگرێت. گوتی: بەڵام نزیکە کە چیتر بەر نەگرێت. دواتر گوتی: هەواڵم بدەنێ لەبارەی دەریاچەی ((طبرية)) گوتمان: لەبارەی چ شتێکیەوە پرسیار دەکەی؟ گوتی: ئایا ئاوی تێدایە؟ گوتمان: بەڵێ، ئاوێکی زۆری تێدایە. گوتی: بەڵام نزیکە کە ئاوەکەی وشک بێ. پاشان گوتی: هەواڵم بدەنێ لەبارەی ((عين زغر)) واتە: کانیاوی زەغەر. گوتمان: لەبارەی چ شتێکیەوە پرسیار دەکەی؟ گوتی: ئایا کانیاوەکە ئاوی تێدایە و خەڵکی بە ئاوی ئەو کانیاوە کشتوکاڵ دەکەن؟ گوتمان: بەڵێ، ئاوی زۆرە و خەڵکەکەشی بە ئاوی کانیاوەکە کشتوکاڵ دەکەن. دواتر گوتی: هەواڵم بدەنێ لەبارەی پێغەمبەری نەخوێندەواران بزانم چیی کردووە؟ گوتمان: لە مەککە دەرچووە و لە ((يثرب)) واتە: "مەدینە" نیشتەجێ بووە. گوتی: ئایا عەرەب دژی وەستانەوە و شەڕیان لەگەڵ کرد؟ گوتمان: بەڵێ. گوتی: ئەی ئەو چی کرد لەگەڵیان؟ پێمان گوت: سەرکەوتووە بەسەر ئەو عەرەبانەی کە لێی نزیکن. ئەوانیش پشتگیرییان کردووە و باوەڕیان پێ هێناوە. دواتر گوتی: ئایا بە ڕاستی ئەو شتە ڕوویداوە؟ گوتمان: بەڵێ، ڕوویداوە. دواتر

گوتی: بەڵام باشتر بوو بۆیان کە گوێڕایەڵییان کردبا. منیش لێرەوە هەواڵتان پێ دەدەم کە من مەسیحی دەجالم، نزیکە کە مۆڵەتی دەرچوون وەربگرم و بێم بە زەویدا بڵاو ببمەوە. هیچ دێهاتێک نەمێنێ کە لە چل ڕۆژدا بۆی نەچم جگە لە مەکە و ((طیبة))، چونکە ئەو دوو شوێنە قەدەغە کراوە لێم و ناتوانم بچمە ناویان. هەر جارێک بمەوێ بچمە ناویان فریشتەیەک بە شمشێرەوە ڕووبەڕووم دەبێتەوە و ڕێگەم لێ دەگرێ، لەپێش هەر دەروازە و دەرگایەکی فریشتە وەستاون و پاسەوانیی لێ دەکەن)).

فاتیمەی کچی قەیس دەڵێت: دواتر کە پێغەمبەر باسەکەی بەتەواوی گێڕایەوە، بە داردەستەکەی لە میمبەرەکەی دەدا و پاشان گوتی: ئێرە ((طیبة))یە، ئێرە ((طیبة))یە، ئێرە ((طیبة))یە. مەبەستی لە ((طیبة)) مەدینە بوو. پاشان گوتی: ((ئایا من ئەو باسەم پێ ڕاگەیاندن؟ )) هەموو گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. دواتر فەرمووی: (( بۆیە بۆم باس کردن، چونکە باسەکەی تەمیمم پێ خۆش بوو لەبارەی دەجال و مەککە و مەدینە، چون زۆر لەوە نزیک بوو کە من بۆم باس کردن. ئاگادار بن ئەو لە دەریای شامەوە دێ یان لە دەریای یەمەن، نا بەڵکوو لە لای ڕۆژهەڵاتەوە دێ، ئینجا پەنجەی بۆ ڕۆژهەڵات ڕاکێشا و گوتی: ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتەوە هات خۆیەتی، ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتەوە هات خۆیەتی. ئینجا فاتیمەی کچی قەیس گوتی: ئەوەی باسم کرد لە پێغەمبەرەوە لەبەرم کردبوو سەلامی خوای لێ بێ.

## چلوهەشت

**ئیبـــراهیم، ئیســـماعیل، هـــاجەر، بەجێهێشـــتنیان لە جێگایەکی وشک و برێن.**

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بـێ دەگێـڕنەوە کە پێغەمـبەر سـەلامی خـوای لـێ بـێ فەرموویەتی: ((سارای خێزانی حەزرەتی ئیبڕاهیم نەزۆک بوو و منـداڵی نەدەبـوو. حەزرەتـی ئیبـڕاهیمیش تەمەنـی زۆر هەڵکشابوو و بووبوو بە هەشتاوشەش ساڵ. سارای خێزانی پێی ناخۆش بوو و لە دڵی گران بوو کە ئیبڕاهیم منداڵی نییە. بـۆیە هـاجەرەی کەنیـزەی هێنـا و بـۆ حەزرەتـی ئیبڕاهیمـی خواست. کاتێک هاجەرە منداڵی بوو، لەبەر چاوی سارا زۆر خـۆی پێـوە بادەدا و شـانازی پێـوە دەکـرد. سـارا زۆر بەوە دڵتەنـگ و بێتـاقەت بـوو و نەیتـوانی بەرگەی ئەو ڕەفتـارانەی هـاجەرە بگرێـت. بـۆیە داوای لە حەزرەتـی ئیبـڕاهیم کـرد کە هاجەرە و ئیسماعیل دوور بخاتەوە و بیان بات بۆ شـوێنێکی دیـکە. حەزرەتـی ئیبـڕاهیم سـەلامی خـوای لـێ بـێ خـۆی و هـاجەرەی هاوسـەری و ئیسـماعیلی شـیرەخۆرە فەڵەسـتینیان بەجـێ هێشـت و وەڕێ کەوتـن تـا گەیشـتنە دۆڵێـک لە نزیـک مەکـکە. لە لای درەختێکـی گەورە لە سـەرووی ((مـوقعی)) زەمـزەمەوە و لە نزیـک کەعـبە داینـان. لەوکاتەشـدا مەکـکە چۆڵەوانی بوو و کەسـی لێ نەبوو. تەنـانەت دڵۆپە ئاوێکیشـی لـێ نەبـوو. ئینجـا کیسـەخورمایەک و دەبە ئـاوێکی بـۆ بەجـێ

هێشتن و هەستا بۆ ئەوەی بڕوات. هاجەرە دوای کەوت و بانگی کرد: بۆ کوێ دەڕۆی؟ دەتەوێ بڕۆی و بەبێ کەسوکار لەو جێگا وشک و بڕێن و چۆڵەوانییە بەجێمان بێڵی؟ چەن جارێک بانگی کرد و ئەمەی لێ دووبارە کردەوە، بەڵام حەزرەتی ئیبڕاهیم لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو و ئاوڕی نەدایەوە. ئینجا هاجەرە لێی پرسیی: خوا فەرمانی ئەوەی پێ کردووی؟ حەزرەتی ئیبڕاهیم گوتی: بەڵێ. ئینجا هاجەرە سوکنایی هات و گوتی: کەواتە خوا لەبیرمان ناکا و بێ کەسوکار نیین. دواتر هاجەرە گەڕایەوە شوێنی خۆی و ئیبڕاهیمیش بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، تا ئەوەندە لێیان دوورکەوتەوە کە لێیانەوە دیار نەما. ئینجا ڕاوەستا و دەستی کرد بە پاڕانەوە و گوتی:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧ ﴾ إبراهيم: ٣٧

واتە: پەروەردگارا! بە ڕاستی من هەندێ لە وەچە و خێزانم لە دۆڵێکی وشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردووە، لەپاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا، لەپاڵ ((بيت الحرام))دا. پەروەردگارا! بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن، تا بەچاکی نوێژ و خواپەرستی ئەنجام بدەن. جا داواکارم دڵی هەندێک لەو خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزیی جۆراوجۆر بەهرەمەندیان بکەیت.

بۆئەوەی سوپاسگوزار بن. هاجەرە بەردەوام شیری دەدا بە ئیسماعیل و بۆ خۆشی لەو خورما و ئاوەی دەخوارد و دەخواردەوە، کە ئیبراهیم بۆی بەجێ هێشتبوون. ماوەیەک بەو شێوەیە مانەوە هەتا ئەو کاتەی خورما و ئاوەکە تەواو بوو و خۆشی شیری پێ نەما بیداتە ئیسماعیل. ئیسماعیلیش لە بێشیری و بێئاوی دەستی کرد بە گریان و بەردەوام دەگریا و دەنووزایەوە. کاتێک دایکی بەو شێوەیە ئیسماعیلی دیت، خەریک بوو دڵی پارچە پارچە بێت لەتاوی. هیچ چارەیەکیشی لەلا نەبوو بۆیە بەناچاری بەجێی هێشت و دیتی کێوی سەفا نزیکترین کێوە لێوەی. چووە سەر کێوەکە و سەیری ناو دۆڵەکەی کرد بە ئومێدی ئەوەی کەسێک ببینێ و یارمەتییان بدا، بەڵام کەسی لێ نەبوو و کەسی نەدیت. لە سەفا هاتە خوار و هاتە ناو دۆڵەکە. پاشان زۆر خۆی هیلاک و ماندوو کرد تا سەرکەوتە سەر کێوی مەڕوە. زۆر چاوی گێڕا بە ئومێدی ئەوەی کەسێک ببینێ و یارمەتییان بدا بەڵام کەس دیار نەبوو. لە تاوی ئیسماعیل و لە تاوی تینوێتی و هیلاکیی خۆی، هەر ئەم کێو و ئەو کێوی دەکرد. جارێک دەچووە سەر سەفا و جارێک دەچووە سەر مەڕوە. تا حەوت جار چوو و هاتەوە. ئیبن عەباس دەڵێت: پێغەمبەر فەرموویەتی:(( هەر لەبەر ئەوەشە کە خەڵک لە حەجدا هاتووچۆی نێوان سەفا و مەڕوە دەکەن)). کاتێک هاجەرە کۆتا جار هاتەوە سەر کێوی مەڕوە لەپڕ گوێی لە دەنگێک بوو بۆیە بە خۆی گوت: ((بێدەنگ بە)). ئینجا بە ئاراستەی دەنگەکە قسەی کرد و گوتی: ئەگەر دەتوانی یارمەتیمان بدە.

دواتر گوێی هەڵخست و سەرنجیدا بینی کەوا فریشتەیەک لە ((موقعی)) زەمزەم بە هەردوو پێی یان بە هەردوو باڵی زەوی دەپشکنێ. لەوکاتەدا ئاو لە ژێر هەردوو پێی یان هەردوو باڵی هەڵقوڵا. کاتێک ئەوەی بینی زۆر دڵخۆش بوو و بەپەلە چوو ئیسماعیلی هێنا و ڕایکرد بەرەو ئاراستەی ئاوەکە. دواتر کە گەیشتە سەر ئاوەکە خێرا خێرا مشتی پڕ دەکرد لە ئاو و دەیدا بە ئیسماعیلی کوڕی هەتا تێر بوو و دواتر خۆشی تێر لێی خواردەوە. ئینجا دەبە ئاوەکەشی لێ پڕکرد. دواتر بە ئەندازەی چنگ و مشتی هاجەرە ئاوەکە هەڵقوڵا.

ئیبن عەباس دەڵێت: پێغەمبەر فەرمووی: ((ڕەحمەتی خوا لە دایکی ئیسماعیل بێ، ئەگەر وازی لە ئاوی زەمزەم هێنابا یان بەو شێوازە بە مشتی ئاوی لێ دەرنەهێنابا، ئێستا زەمزەم سەرچاوەیەکی دیاریکراو و گەورەی ئاو دەبوو)).

دوای ئەوەی هاجەرە تێر لێی خواردەوە، ئینجا شیری دا بە ئیسماعیل و ئەویش تێر شیر بوو. فریشتەکە پێی گوت: ترسی ونبوون و لەناوچوونتان نەبێ، چونکە لە داهاتوو یەکێک لە ماڵەکانی خوا لێرە دەبێ کە مێردەکەت و کوڕەکەت بنیادی دەنێن. خواش هەرگیز کەسوکاری ئیبراهیم فەرامۆش ناکات. ئینجا پڕ بوو لە باڵندە و تەیر، کە دەهاتنە سەر ئاوەکە و بەردەوام لەسەری دەسووڕانەوە. دواتر هۆزی جورهەم بەو ناوەدا تێپەڕین و دیتیان کە تەیر و باڵندە بەسەر ئەو ناوچەیەدا دەسوڕێنەوە. سەرۆک هۆزەکەیان گوتی: باشە ئێمە چەن ساڵە بەو ناوەدا هاتووچۆ دەکەین تا ئێستا لێرە ئاومان

نەدیــوە. ئێســتا ئەو تەیــرانە چــی دەکەن لێــرە؟ ئینجــا دوو کەسیان نـارد تـا بـزانن ئـاوی لێیە یـان نـا؟ ئەوانـیش چـوون ســەیریان کــرد ئــاوی لێــیە. یەکســەر گەڕانەوە و بە هەمــوو هۆزەکەیــان ڕاگەیانــد. ئەوانــیش هەموویــان هــاتن و ســەیریان کـرد ئافرەتێـک و منـداڵێکی سـاوا لە لای ئـاوەکەن. سـەلامیان کـرد و گـوتیـان: ڕێگەمـان دەدەی بێینە ئێـرە؟ ئەویـش گـوتی: بەڵــێ بەڵام بەو مەرجەی ئیشــتان بەو ئــاوە نەبــێ، ئەوانــیش گوتیان: باشە حەقمان نییە.

ئیبن عەباس دەڵێت: پێغەمبەر فەرمووی: ((دایکی ئیسماعیل زۆر پێیان دڵخۆش بوو و ڕێزی لـێ گرتن، چونکە مـاوەیەکی زۆر بەتەنیا مـابوویەوە و هەستی بە ترس و تەنیایی دەکرد. ئینجا ئەوانیش هاتن و بە هەمـوو شـتێکیانەوە بـارگە و بنەیـان لەوێ خســت و لەوێ نیشــتەجێ بــوون. دواتـر بە تێپەڕبـوونی کات ئەو ناوچەیە ئاوەدان بوو و خەڵک زیاتر ڕووی تێدەکرد. ئیسماعیل گەورە بوو و لەو هۆزە فێری عەرەبی بـوو (هـۆزی جورهەم). ئەوانیش زۆریان خۆش دەویست و کاتێک گەیشـتە تەمەنی پێگەیشتن و عاقڵی، کچێکیـان لە هـۆزەکەی خۆیـان پـێ دا. مــاوەیەک دوای ژنهێنــانی ئیســماعیل هــاجەرەی دایکــی وەفــاتی کــرد. ڕۆژێکیــان ئیبــڕاهیم گەڕایەوە بــۆ ئەوەی ســەردانیان بکـات. ڕۆیشــتە مـاڵی ئیسـماعل و لە دەرگـای دا، خێزانــی ئیســماعیل دەرگــای کــردەوە و بەخێــر هــاتنی کــرد. حەزرەتــی ئیبــڕاهیم گــوتی: ئەی ئەوە کــوا ئیســـماعیل؟ خێزانەکەی گـوتی: چـووەتە دەرەوە بـۆ ئەوەی شـتێکمان بـۆ پەیدا بکـات بیخۆین. لە گێرانەوەیەکـی دیکەدا دەڵـێ چـووە بـۆ

ڕاو و شکار. دواتر حەزرەتی ئیبڕاهیم پرسیاری ژیانی ڕۆژانە و حاڵ گوزەرانیانی لێ کرد. ئەویش گوتی: ئێمەش مرۆڤین و بە ڕاستی ژیانمان زۆر ناخۆشە و لە تەنگ و چەڵەمە و برسێتی داین. حەزرەتی ئیبڕاهیم پێی گوت: باشە ئەگەر هاوسەرەکەت هاتەوە سەلامی منی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ با دەرگای ماڵەکەی بگۆڕێ. خوا حافیزی لێ کرد و گەڕایەوە فەڵەستین. دواتر کە ئیسماعیل گەڕایەوە ماڵ، وەک ئەوەی هەستی بە شتێک کردبێ یەکسەر پرسیاری لە خێزانەکەی کرد و گوتی: کەس هاتووە بۆ لاتان؟ ئەویش گوتی: بەڵێ پیاوێکی پیری ئاوا و ئاوا بوو. پرسیاری تۆی کرد و منیش بۆم باس کرد. دواتر پرسیاری گوزەران و ژیانی کردین، منیش پێم گوت کە ژیانمان زۆر ناخۆشە و لە تەنگ و چەڵەمە و برسێتی داین. ئیسماعیل پرسیی: ئەی هیچی دیکەی نەگوت؟ خێزانەکەی گوتی: با، سەلامی لە تۆ کرد و گوتیشی با دەرگای ماڵەکەی بگۆڕێ. ئیسماعیل یەکسەر تێگەیشت و گوتی: ئەوە ئیبڕاهیمی باوکم بووە و مەبەستی لە دەرگا گۆڕینەکە، ئەوە بووە کە لە تۆ جیا ببمەوە. ئینجا پێی گوت کە بڕواتەوە ماڵی باوکی و دواتر کچێکی دیکەی لەو هۆزە مارە کرد و کردی بە هاوسەری. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر، ئینجا ڕۆژێکیان حەزرەتی ئیبڕاهیم دووبارە گەڕایەوە لای ئیسماعیل و لە دەرگای ماڵەکەی دا، بەڵام قەدەری خوا ئەوجارەشیان لە ماڵ نەبوو، خێزانەکەی هات دەرگای کردەوە و بەخێرهاتنی کرد. حەزرەتی ئیبڕاهیم گوتی: ئەی ئەوە کوا ئیسماعیل؟ خێزانەکەی گوتی: چووەتە دەرەوە بۆ گەڕان بە

دوای کاسـبیدا. ئینجـا حەزرەتـی ئیبـراهیم لێـی پرسـیی: ئەی گوزەرانتـان چۆنە؟ خێزانەکەی گـوتی: سـوپاس بـۆ خـوا زۆر باشـین و بێ کەموکوڕیین. حەزرەتـی ئیبـراهیم پرسیی: ئەی خواردنتـان چییە؟ خێزانەکەی گـوتی: گۆشـت. ئینجـا پرسـیی: ئەی خواردنەوەتان چییە؟ ئەویش گوتی: ئاو. ئینجـا حەزرەتی ئیبڕاهیم دووعای بۆ کردن و گوتی: خوایە بەرەکەت بـخە نـاو ئەو گۆشـت و ئـاوە. پێغەمـبەر سـەلامی خـوای لـێ بـێ دەفەرمـووێ: ((لەوکـاتەدا گەنـم نەبـوو، خـۆ ئەگەر گەنمیـان هەبـوایە، حەزرەتـی ئیبـڕاهیم دووعـای بەرەکەتـی بـۆ ئەویـش دەکـرد)). ئینجـا هەر کەسـێک لە دەرەوەی مەکـکەوە هاتبـا، ئەوان میوانـدارییان دەکـرد و خزمەتیـان دەکـرد. لە گێڕانەوەیەکـی تـردا هـاتووە کە ئەوکـاتەی حەزرەتـی ئیبڕاهیم چـووەتە مـاڵی ئیسـماعیل، خێـزانەکەی دەرگـای کـردووەتەوە. حەزرەتـی ئیبـڕاهیم لێـی پرسـیوە کـوا ئیسـماعیل؟ ئەویـش گوتویەتی کە لە ڕاو و شکارە، دواتـر زۆر داوای لە حەزرەتـی ئیبـڕاهیم کـردووە کە بچێـتە ژوورەوە بـۆ ئەوەی خـواردن و خواردنەوەی بۆ بێنێ و پشـوو بـدات لە ماڵەوەیـان. حەزرەتـی ئیبـڕاهیمیش لێـی پرسـیوە: خـواردن و خواردنەوەتـان چییە؟ خێـزانەکەی گوتـویەتی خـواردن و خواردنەوەمـان گۆشـت و ئاوە. ئینجا ئیبڕاهیم دووعای بۆ کردوون و گوتویەتی: خوایە بەرەکەت بـخە نـاو خـواردن و خواردنەوەیـان. واتە: گۆشـت و ئـاو. پێغەمـبەر دەفەرمـووێ: ((بە هـۆی ئەو دووعایـانەی حەزرەتی ئیبڕاهیمەوە خوا بەرەکەتی زیاتری بەسـەردا ڕشـتن و لە هەموو کەس بێ نیاز بوون)). ئینجـا حەزرەتـی ئیبڕاهیم

به خێزانی ئیسماعیلی گوت: ئەگەر مێردەکەت هاتەوە، سەلامی منـی پـێ بـگەیەنە و پێـی بڵـێ کە بـاش ئاگـای کە دەرگـای ماڵەکەی بێت و با نەیگۆڕێ. دواتر کە ئیسماعیل گەڕایەوە لە خێزانەکەی پرسیی: ئایا کەس هـاتووە بۆ لاتـان؟ خێزانەکەی گوتی: بەڵێ پیاوێکی پیری نوورانی هاتبوو. پرسیاری تۆی لێ کـردم و منـیش بـۆم بـاس کـرد. دواتـر پرسـیی: گوزەرانمـان چـۆنە؟ منـیش پـێم گـوت کە زۆر باشـین و بـێ کەموکـوڕیین. ئیسـماعیل گـوتی: ئەی هیچـی دیـکەی نەگـوت؟ خێـزانەکەی گـوتی: بـا، ئەوەشـی گـوت کە بە ئیسـماعیلی هاوسـەرت بڵـێ ئاگـای لە دەرگـای مـاڵەکەی بێـت و بـا نەیگـۆڕێ. ئیسـماعیل گـوتی: ئەوە بـاوکم بـووە و مەبەسـتی لە دەرگـای مـاڵەکەش تۆیە و داوای کردووە کە ئاگام لێت بێ و لێت جیا نەبمەوە. ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم مـاوەیەکی دیکەش لێیان دوور بوو. هەتـا ڕۆژێکیـان گەڕایەوە و سـەیری کـرد ئیسـماعیل لە ژێـر درەختە گەورەکەی نزیک زەمزەم دانیشتووە و خەریکی تیر دروستکردنە. کاتێک ئیسـماعیل حەزرەتـی ئیبراهیمـی بـاوکی دیت، بەپەلە هەستا و بەرەو پیری چوو. کاتێک گەیشتنە یەک هەردووکیـان باوەشـیان لێکـدا و یەکتریـان مـاچ کـرد و گەشانەوە بە دیتنی یەکتری. دواتر حەزرەتی ئیبراهیم گـوتی: ئەی ئیسـماعیل! خـوا فەرمـانی پـێ کـردووم بە ئەنجامـدانی کارێـک. ئیسـماعیل گـوتی: پەروەردگـارت فەرمـانی چـی پـێ کردووی ئەوە بکە. حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: تۆش یارمەتیم دەدەی؟ ئیسماعیل گوتی: بەڵێ منیش یارمەتیت دەدەم. ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: خوا فەرمانی پێ کردووم کە ماڵێک

لێره دروست بکەم بۆ عیبادەت و پەرستنی خوای تاک و تەنیا. کە (مەبەستی پێی دروستکردنی کەعبەی ماڵی خوا بوو). ئاماژەشی بۆ جێگاکە کرد کە گردێکی بەرز بوو لە نزیک خۆیان. ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم دەستی کرد بە دانانی بناغەی کەعبە و ئیسماعیلیش بەردی بۆ دەهێنا. کاتێک دیوارەکەیان بەرز کردەوە، حەزرەتی ئیبراهیم بە ئیسماعیلی گوت کە بەردێکی چاکی بداتێ بۆ ئەوەی خەڵک لە دوورەوە بیبینێ و زوو بیناسنەوە. حەزرەتی جوبرائیلیش سرووشی بۆ کرد کە ئەو بەردە ڕەشە دانێت. ئینجا ئیسماعیل بەردە ڕەشەکەی دایە و ئەویش لە سەر گۆشەی کەعبەی دانا. کاتێک لە تەواوکردنی نزیک بوونەوە، لەگەڵ هەر بەرد دانانێک ئەو دوعایەیان دەکرد و دەیان گوت:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ ﴾ البقرة: ١٢٧

واتەکە: "ئەی پەروەردەگارا! ئەم کارەمان لێ وەربگرە، بە ڕاستی هەر تۆ بیسەر و زانای."

هذا حديث صحيح اخرجه البخاری

# چیرۆکی چلونۆ

## سەرەتای دابەزینی سرووش بۆ پێغەمبەر.

لە عایشـــەی دایکـی ئیمانـدارانەوە سـەلامی خـوای لــێ بــێ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((یەکەم شت کە بەسەر پێغەمبەردا هـات خەونـی خۆشـی دەدیـت. وای لـێ هـاتبوو هەر خەونێکـی دەدیت، وەکوو ڕۆژی ڕووناک وەڕاست دەگەڕا. پاشان خەڵوەت و گۆشـەگیری لەلا خۆشەویسـت کـرا. بـۆ ئەوەش بەردەوام دەچوو بۆ ئەشکەوتی ((حـرراء)) و جاری وابوو چەن ڕۆژێک لەسـەر یەک لەوێدا دەمـایەوە و خواپەرسـتی دەکـرد. دواتـر دەگەڕایەوە لای کەسوکارەکەی. لە گێڕانەوەیەکی دیکە ئەوەشـی بـۆ زیـاد کـراوە کە دواتـر دەگەڕایەوە بـۆ لای خەدیـجەی هاوسەری. تا ئەوکاتەی کە بۆ یەکەم جار سرووشی بۆ هات لە ئەشکەوتی ((حـرراء))، ئینجا جوبرائیل هـات و پێی گـوت: اقرأ. واتە: بخوێنە. ئەویش وەڵامی دایەوە و گوتی: خوێندەواریم نییە و ناتوام بخوێنم. دواتر گرتمی و توند بەخۆیەوە گوشیمی. بە ڕاددەیەک کە هەسـتم بە ئـازار کـرد. پاشـان بەری دام. ئینجـا دووبارە گوتی: بخوێنە. منیش پێم گوت خوێندەواریم نییە. بۆ جاری دووەم گرتمی و توند بەخۆیەوە گوشیمی، بە ڕاددەیەک کە هەستم بە ئازار کرد. ئینجا بەری دام. دواتر گوتی: بخوێنە. منیش پێم گوت کە خوێندەواریم نییە، بۆ جاری سێیەم گرتمی و توند بەخۆیەوە گوشیمی، بە ڕاددەیەک کە هەستم بە ئازار کرد. ئینجا بەری دام و گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝٣ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝٥ ﴾ العلق: ١ ـ ٥

واتە: ((ئەی موحەمەد! بە ناوی ئەو پەروەردگارتەوە بخوێنە، کە مرۆڤی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو لەناو منداڵداندا دروست کرد. بخوێنە لە کاتێکدا پەروەردگاری تۆ بەخشندەترینە. پەروەردگارت ئەو زاتەیە کە بە هۆی قەڵەمەوە زانست و زانیاری بڵاوکردۆتەوە. ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە، کە نەیانزانیون)). پێغەمبەر کە ئەو ئایەتانەی بیست بە ترسولەرزەوە گەڕایەوە ماڵەوە لای خەدیجەی کچی خوەیلید خوا لێی ڕازی بێ. ئینجا گوتی: دامپۆشن، دامپۆشن. ئینجا دایانپۆشی تا ئەوکاتەی ترسەکەی تۆزێک ڕەویەوە. دواتر باسەکەی بۆ خەدیجەی هاوسەری باس کرد و گوتی: ئەی خەدیجە! ئەوە چیمە و بۆ وام بەسەر دێ؟ بەڕاستی زۆر ترسام شتێکم لێ بێ. ئینجا خەدیجە پێی گوت: نا ئەی موحەمەد وا نییە، گەشبین بە، سوێند بە خوا، هەرگیز خودا سەرشۆڕت ناکا. چونکە تۆ سیلەی ڕەحم بەجێ دێنی. ڕاستگۆیی لە قسەکردندا، ماڵ دەبەخشییە هەژار و هەتیو و نەداران، یارمەتی خەڵکی نەدار و بێلانە دەدەی، ڕێز لە میوان دەگری، یارمەتی ئەو کەسانە دەدەی، کە تووشی کارەسات و لێقەومان دەبن. دواتر خەدیجە و موحەممەد ڕۆیشتن بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعەزیز، کە کوڕە مامی خەدیجە بوو. وەرەقەی کوڕی نەوفل لە سەردەمی جاهیلیەتدا بووبوو بە نەسڕانی. کابرایەکی پیری کوێر بوو و زمانی عیبری دەزانی.

ئەوەندەی خوا ویستبای دەیتوانی ئینجیل بە عیبری بنووسێتەوە. کاتێک گەیشتنە لای و دانیشتن، خەدیجە گوتی: ئەی کوڕە مام! گوێ لە برازاکەت بگرە بزانە دەڵێ چی! وەرەقە گوتی: کوڕم چی بووە؟ ئینجا پێغەمبەر ئەوەی دیتبووی و بەسەری هاتبوو بۆی گێڕایەوە. ئینجا وەرەقە وەڵامی دایەوە و گوتی: ئەی موحەمەد ئەوە (ناموس) واتە: جوبرائیل بووە. هەمان ئەو فریشتەیەی کە خوا دایبەزاندە سەر مووسا. هیوام دەخواست گەنج بام و یارمەتیم دابای. خۆزگە زیندوو بام ئەوکاتەی کە گەلەکەت دەرت دەکەن. ئینجا موحەممەد گوتی: یانی گەلەکەم دەرم دەکەن؟ وەرەقە گوتی: بەڵێ، هیچ کەس نەبووە کە بەو پەیامەی بۆ تۆ هاتووە هاتبێ، ئیلا گەلەکەی دەریان کردووە و ئازاریان داوە. ئەگەر بۆ ئەوکاتەش زیندوو مام، ئەوە بە هەموو توانایەکمەوە هەوڵی یارمەتیدان و سەرخستنت دەدەم. دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم وەرەقە وەفاتی کرد و "سرووش"یش ڕاگیرا)).

هذا حديث صحيح متفق عليه.

## پەنجا

### خەونێکی سەیری پێغەمبەر.

سەمەرەی کوڕی جوندب خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر سەلامی خوا لێ بێ زۆرکات بە هاوەڵانی دەفەرموو: کێتان خەونی دیتووە با بیگێڕێتەوە. ئەوانیش ئەوەندەی خەونیان دیتبا، بۆیان دەگێڕایەوە. بەیانییەکیان دوای ئەوەی هاوەڵان لە گێڕانەوەی خەونەکانیان تەواو بوون،، پێغەمبەر فەرمووی: ((ئەمشەو لە خەونمدا دوو کەس هاتنە لام و پێیان گوتم: وەرێکەوە و لەگەڵمان وەرە. منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم تا ئەوکاتەی گەیشتینە پیاوێک کە ڕاکشابوو و پیاوێکی دیکە لەسەر سەری ڕاوەستابوو و بەردێکی گەورەی پێ بوو بە هەموو هێزی، بەردەکەی لە دەم و چاوی کابرا دەدا و دەم و چاوی تێک دەقوپاند. دواتر بەردەکە خلۆر دەبوویەوە و کابرا دەچوو بەردەکەی دەهێنایەوە. هەتا دەهاتەوە پیاوەکەی دیکە دەموو چاوی دەهاتەوە جێی خۆی و چاک دەبوویەوە. پیاوەکەش وەک یەکەم جار بەردەکەی بە دەم و چاویدا دەکێشا و هەر دووبارە و دووبارەی دەکردەوە. گوتم: سوبحانەڵلا! ئەوانە کێن؟ گوتیان: وەرێکەوە، وەرێکەوە. پاشان وەرێکەوتین. لە ڕێگەدا چاومان بە پیاوێک کەوت لەسەر پشت ڕاکشابوو و پیاوێکیش بە چەند کەڵبە و قولابێکی ئاسنەوە لەسەر سەری ڕاوەستابوو، ئینجا بەو کەڵبە و قولابە لایەکی دەموچاوی دەڕنی و هەتا وای لێ دەهات دەم و چاو و لووتی دەچووە پشتی سەری و پشتەسەری دەهاتە جێی دەموچاوی. دواتر لایەکەی

دیکەی دەموچاوی دەڕنی و ڕووخسار و لووتی دەچووە پشتی سەری. تا لەو لایەی تەواو دەبوو، لایەکەی دیکەی وەک خۆی لێ دەهاتەوە و چاک دەبوویەوە. ئیدی ئەویش بەو شێوەیە هەر دووبارە و دووبارەی دەکردەوە. گوتم: سوبحانەڵڵا! ئەوانە کێن؟ گوتیان: وەڕێکەوە، وەڕێکەوە. ئینجا ئەوێشمان بەجێ هێشت و وەڕێکەوتین تا گەیشتینە چاڵێک کە وەک تەندوور وابوو و قیژە و هاوارێکی زۆر لەناو تەندوورەکە دەهات. کاتێک سەرنجمان دا، دیتمان کە پڕە لە ژن و پیاوی ڕووت و لە ژێر تەندوورەکەوە گڕی ئاگریان بۆ دێت. بە هۆی ئەو گڕەشەوە ئەو قیژە و هاوارەیان دروست کردبوو. گوتم: ئەوانە کێن؟ گوتیان: وەڕێکەوە، وەڕێکەوە. ئینجا ئەوێشمان بەجێ هێشت و بەڕێکەوتین تا گەیشتینە ڕووبارێک کە ڕەنگی ئاوەکەی وەکوو خوێن سوور بوو. کەسێکیش لەناو ڕووبارەکە بوو مەلەی دەکرد. پیاوێکیش لە ڕۆخی ڕووبارەکە بەردێکی زۆری کۆ کردبوویەوە. مەلەوانەکەش ئەوەندەی لە توانایدا بوو مەلەی دەکرد و دواتر دەهاتە لای ئەو پیاوەی بەردەکانی کۆ کردبوویەوە. ئینجا دەمی دەکردەوە و پیاوەکە بەردەکانی هەموو دەخستە دەمی هەتا دەمی پڕ دەبوو و پاشان دەگەڕایەوە ناو ئاوەکە و دەستی دەکردەوە بە مەلەکردن. دواتر مەلەوانەکە دەمی بەتاڵ دەبوویەوە و دووبارە دەهاتەوە لای پیاوەکە، ئەویش بەهەمان شێوەی یەکەم جار دەمی کابرای مەلەوانی پڕ دەکردەوە لە بەرد و دواتر مەلەوانەکە دەگەڕایەوە ناو ڕووبارەکە. بەو شێوەیە هەر دووبارە و دووبارەیان دەکردەوە. گوتم: ئەوانە کێن؟ گوتیان: وەڕێکەوە، وەڕێکەوە. ئەوێشمان بەجێ هێشت و وەڕێکەوتین هەتا گەیشتینە شوێنێک پیاوێکمان

بینی که هەرگیز لەمەوپێش پیاوی ئاوا ناشرینمان نەدیتبوو. ئاگرێکی کردبوویەوە و خەریکی خۆشکردنی ئاگرەکە بوو و بە دەوریدا دەسووڕایەوە. گوتم ئەوە کێیە؟ گوتیان: وەڕێکەوە، وەڕێکەوە. ئینجا ئەوێشمان بەجێ هێشت و وەڕێکەوتین هەتا گەیشتینە باخچەیەکی زۆر گەورە، کە هەرگیز لەمەوپێش باخچەی ئاوا گەورە و خۆشمان نەدیتبوو، جگە لەوەی جوانییەکی بێوێنەی هەبوو و هەموو ڕەنگەکانی بەهاری تێدا بەدی دەکرا، ئینجا پیاوێکی زۆر بالابەرز کە ئەوەندە بالای بەرز بوو نزیک بوو سەری نەبینین لەگەڵ یەک قەرتاڵە منداڵ کە لە چواردەوری بوون لە ناو باخچەکەدا بوو. گوتم: ئەو پیاوە کێیە؟ ئەی ئەو مندالانە چین و کێن؟ گوتیان: وەڕێکەوە، وەڕێکەوە. ئەوێشمان بەجێ هێشت و وەڕێکەوتین تا گەیشتینە لای درەختێکی بێئەنداز گەورە و فراوان و جوان! کە پێشتر هەرگیز درەختی ئاوا گەورە و فراوان و جوانم نەدیتبوو. گوتیان: سەرکەوە. ئینجا سەرکەوتین و چووینە ناوی هەتا گەیشتینە شارێک کە هەموو کۆشک و بیناکانی لە خشتی زێڕین و زیوین دروست کرابوو. ئینجا چووینە لای دەرگای شارەکە و لە دەرگامان دا، دەرگایان بۆ کردینەوە ئێمەش چووینە ناوی. کاتێک چووینە ناوی جۆرە مرۆڤانێکمان دیت، کە لایەکیان هەتا وەسفی کەی جوان و درەوشاوە بوو، لایەکەی دیکەشیان هەتا بڵێی ناشرین و دزێو بوو. ڕووبارێکیشی لێ بوو کە تەواوتەواو سپی بوو. ئینجا پێیان گوترا کە بڕۆنە ناو ئەو ڕووبارەوە. ئەوانیش چوونە ناو ڕووبارەکە و کاتێک هاتنە دەر، ئەو لایە ناشرین و دزێوەیان نەمابوو و لەڕاددەبەدەر درەوشاوە و جوان بووبوون. دواتر شوێنێکیان پێشاندام و گوتیان: ئەوە

بەهەشتی عەدەنە و ئەوەش ماڵەکەی تۆیە لە بەهەشت. کاتێک سەرم بەرز کرد، کۆشکێکم دیت کە وەکوو هەوری سپی وابوو. گوتم: رەحمەتتان لێبێ رێ بدەن بچمە ناوی. گوتیان: ئەوە هی تۆیە و هەر دەچییە ناوی، بەڵام ئێستا نا. ئینجا گوتم: باشە من ئەمشەو شتی زۆر سەیروسەمەرەم دیت، ئەو شتانە چی بوون من دیتمن؟ ئەوانیش گوتیان: باشە ئێستا کاتی ئەوەیە پێت بڵێین ئەوانە چی بوون. ئەو پیاوەی یەکەم جار دیتت کە بەردەکەیان لە سەری دەدا و سەر و دەموچاوی تێک دەقوپا، ئەوە پیاوێکە کە قورئانی بۆ دەخوێننەوە، بەڵام ئەو پێی ناخۆشە و رەتی دەکاتەوە. لە کاتی نوێژە فەرزەکاندا دەنوێ و نوێژەکانی لا گرنگ نییە. ئەوەشی کە پێستی دەم و لووت و چاوی دەچووە پشتی سەری و پشتە سەری دەهاتە پێشەوەی، ئەوە کەسێکە کە هەر بەیانی لەماڵ دێتە دەر دەست دەکا بە درۆی زۆر گەورە و ناقۆڵا. ئەو پیاو و ژنانەشی کە لەناو تەندوورەکە گریان بۆ دەهات و زیقە و هاواریان بوو، ئەوە ژن و پیاوی زیناکارن لە دنیادا. ئەو پیاوەشی کە لە رووبارە سوورەکەدا مەلەی دەکرد و دواتر دەمی پڕ دەکرا لە بەرد، ئەوە کەسی سووخۆرە لە دنیادا. ئەو پیاوە ناشیرنەش کە ئاگرەکەی کردبوویەوە و بە دەوریدا دەسووڕایەوە، ئەوە مالیکی دەرگاوانی دۆزەخە. ئەو پیاوە باڵابەرزەش کە لەناو باخچەکەدا بوو. ئەوە حەزرەتی ئیبراهیمە و منداڵەکانی دەوریشی ئەو منداڵانەن کە پێش باڵغبوون مردوون و پاکن. هەندێک لە هاوەڵان گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا! منداڵی موشریک و کافرانیش پاکن و دەچنە بەهەشت؟ پێغەمبەر فەرمووی: ((بەڵێ، ئەوانیش. منداڵان هەموویان پاکن و دەچنە بەهەشت)). ئەو کەسانەشی کە لایەکیان جوان و لایەکیان

ناشـرین بـوو، ئەوانەن کە لە دنیـادا کـردەوەی چـاک و خراپیـان تێکەڵ کردووە و دواتر خوا لێیان خۆش دەبێ)).

هذا حديث صحيح اخرجه بخاری و احمد

**کتێبێک بۆ:**

- بۆ مامۆستا
- بۆ بانگخواز
- بۆ پەروەدەکاری خێزان
- بۆ ئیمامی مزگەوت
- بۆ کۆبوونەوەی هاوڕێیان و نزیکان
- بۆ هەموو مرۆڤایەتی






لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان